# سۆفیگەری مەولەوی

تویژینەوەیەکی زانستیە پێشکەش بە بەشی شەریعە کراوە
لە زانکۆی سلێمانی لە کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان


ئامادەکردنی
فرید حمید عوالقادر

بە سەرپەرشتی
م. حمید محمد أمین عزیز


2018

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ
دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾

﴿المجادلة: ١١﴾

# پێشکەش بێت بە

ڕۆحی گەورەمان وخۆشەویستمان، شەفاعەتکارمان وپێشەوا وإمام وهیدایەتکارمان، پێغەمبەرمان،
خۆشەویستی خودا، پێغەمبەری ئیسلام محمد (ﷺ).
بۆ ئارامگا بێ نازەکەی حەزرەتی مەولەوی...
بۆ ئەو کەسەی کەخۆشەویستیەکەی لەدڵمدا ڕەگی داکوتاوە بەقوڵی
بۆ ئەوانەی بەخشندەبوون لەگەڵماندا
بۆ ئەو کەسەی سپێدەی وسەرلەبەیان ئومێدی پێ بەخشیوم، وە چاودێریم دەکات لە ئێوارەی داهاتوودا.
بۆ خۆری ژیانم کە ئاوا نابێ گەر خۆری هەموو گەردوون ئاواش ببێ
پێشکەشی ناکەم بەڵکو تەنها دیارییەکی بچوکە دەستت ماچ دەکا
بۆ تۆ، تۆ، ئەی دایکە....
گەر هەموو دونیامان لەبەرچاو تەنگ بێ تەنها خۆشەویستی تۆمان بەسە بۆ چوونە ناو بەهەشتەوە
ئەی هەموو تنۆکێکی ئارەقەی سەر ڕێگەی سەرکەوتنەکانم
بۆ تۆ ئەی خۆشەویسترین کەسی نێو دڵم
بۆ تۆ، بەڵێ بۆ تۆ، ئەی باوکە...
بۆ هەموو ئەو چاوانەی کە لە ڕۆحم دا ڕواون
بۆ ئەوانەی خۆشیان دەوێم وخۆشم ویستوون
بۆ ئێوە هاوڕێکانم...
بۆ ئێوە برا ئازیزەکانم...
بۆ ئێوە شەهیدانی ڕێگای ڕەزامەندی خوا....
پێشکەش بێت بەئێوە بەرهەمی هەوڵ وماندووبوونمان...

**توێژەر**

# سوپاس وپێزانین

سوپاس وستایشی بێ پایان بۆ خوای بەخشندە ومیهرەبان، هەزاران درووود وسلاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار ورابەر وخۆشەویستمان(ﷺ) ، بۆ یاران ویاوەران وپەیڕەوانی تا ڕۆژی دوایی.

لەژێر چەتری شاگردانی دەستی مامۆستایان وکەسی بەئەزموونی ئەم خاکە، مامۆستایان بەردەوام بەهۆی وتە جوانەکانیان وبەدڵسۆزییەکی جەستەی ورۆحییەوە هەردەم خزمەتیان بەفێرخوازان کردووە.

بەتێکڕای سەرجەم فێرخوازان ئێمە هەمیشە خۆمان بەقەرزار باری مامۆستایان زانیووە، چونکە ئەوان بوونە هۆی ئەوەی کە ئێمە هەر لەسەرەتای خوێندنی سەرەتاییەوە و لەدەست پێکردنی ﴿ئەلیف وبا﴾ە تا ئێستای ئەم قۆناغەی خوێندن کەئێمەی تێدان هەمیشە وەك چۆن حەزیان بە سەرکەوتنی کوڕ و کچەکانی خۆیان کردووە، بەهەمان شێوەش سەرکەوتنی سەرجەم فێرخوازانیان بەلاوە گرنگ بووە.

بۆیە بە پێویستی دەزانم سوپاسی مامۆستا «حمید محمد أمین عزیز»، سەرپەرشتیاری توێژینەوەکەمان بکەم، چونکە هاوکاری پێویستی کردووم، وبەشێوەیەکی ورد لاپەڕە بە لاپەڕە وردبینی توێژینەوەکەمانی کردووە ولە هەڵە وکەمووکورتیەکان ئاگاداری کردوومەتەوە.

وە زۆر سوپاسی مامۆستا «غازی شێخ محمد شێخ کامل نێرگسەجاڕی» دەکەم کە هاوکاری کردووم وکاتی خۆی پێ دام وچەند بابەتێکی ناو توێژینەوەکەی بۆ ڕوونکردمەوە.

وە زۆر سوپاس مامۆستا «ئاوات شێخ محمود شێخ صاحیب نەقشبەندی» دەکەم کە زانیاری پێ داوم لە چۆنێتی ڕێکخستنی پلانی توێژینەوەکەم.

سوپاسی ئەو مامۆستا وئەو هاوڕێیانەم دەکەم کە تەنانەت بە پیتێکیش هاوکاریان کردووم.

وە سوپاسی سەرجەم مامۆستایانی بەشی «شەریعە» دەکەم، لەماوەی ئەم چوار ساڵەدا سوودم لە زانیارییەکانیان وەرگرتووە .

داواکارم لەخوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە و سەربەرزی دونیا وسەرفرازی قیامەت بن..

# پێڕست


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| قورئان........................................................................ | أ |
| پێشکەش بە.................................................................. | ب |
| سوپاس نامە.................................................................... | ج |
| پێشەکی ....................................................................... | ١-٢ |
| **بەشی یەکەم: سۆفیگەری پێناسە ومەدرەسەکان** ........................... | ٣ |
| باسی یەکەم: پێناسەی سۆفیگەری.............................................. | ٣-١١ |
| باسی دووەم: مێژووی سۆفیگەری................................................ | ١٢ |
| لقی یەکەم: سۆفیگەری لای یەهودیەکان........................................ | ١٤ |
| لقی دووەم: سۆفیگەری لای مەسیحیەکان....................................... | ١٨ |
| لقی سێیەم: سۆفیگەری لای هیندەکان......................................... | ٢٤ |
| لقی چوارەم: سۆفیگەری لای مسوڵمانەکان..................................... | ٢٩ |
| باسی سێیەم: قوتابخانە وڕێبازە تەسەووفییەکان................................ | ٣٧ |
| باسی چوارەم: هاتنی هەردوو ڕێبازی قادری ونەقشی بۆ کوردستان............ | ٤٦ |
| **بەشی دووەم: مەولەوی ژیان وکەسێتی وبەرهەمەکانی**............................ | ٥١ |
| باسی یەکەم: کورتەیەك لەژیانی مەولەوی........................................ | ٥٢ |
| باسی دووەم: شێوە وڕووخساری مەولەوی......................................... | ٥٥ |
| باسی سێیەم: مەولەوی وعەشیرەتەکەی............................................ | ٥٦ |
| باسی چوارەم: خێزان ونەوەکانی.................................................. | ٥٨ |
| باسی پێنجەم: چەند سەرگوزەشتەیەك لە ژیانی مەولەوی......................... | ٦٢ |
| باسی شەشەم: بەرهەمەکانی مەولەوی ویەکێك لەشاکارە ناوازەکانی................ | ٦٧ |
| باسی حەوتەم: مامۆستا ومورشیدەکانی مەولەوی.................................. | ٧٤ |
| باسی هەشتەم: مەولەوی لە دیدی ئەدیباندا........................................ | ٧٦ |

**بەشی سێیەم: سۆفیگەری مەولەوی**............................................ ٨١
باسی یەکەم: مەقامەکان لای مەولەوی.................................... ٨٢
باسی دووەم: حاڵەکان لای مەولەوی........................................ ٩٣
باسی سێیەم: مەی لای مەولەوی.............................................. ١٠٤
باسی چوارەم: صلاڵواتدان وپێغەمبەر ﷺ.................................... ١٠٧
باسی پێنجەم: ئیسرا ومیعراج..................................................... ١٠٩
باسی شەشەم: مرۆڤ دۆستی ولێبووردەی مەولەوی......................... ١١٣
کۆتایی................................................................................... ١١٦
سەرچاوەکان........................................................................... ١١٨

# پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ خوای گەورە کە ڕێنمای کردوین بۆ ڕێگای پاکی بەرزی ئیسلام وئیمان، وەدرووود وسلاَوی نەبڕاوە بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەر و سەروەر وئازیزمان(ﷺ) ویارانی تا ڕۆژی دوایی..

نوسەران ومێژوو نوسان لە کۆن وئێستا بۆچوونی جیایان هەیە سەبارەت بە سەرەتای سەرهەڵدانی تەسەووف ومانای وشەی سۆفی،چونکە تەسەووف لەسەرجەم دینەکاندا بوونیان هەبووە، چ دینە ئاسمانیەکان وچ دینە دانراوەکان.

هەر لە سەرەتای سەدەی دوانزەیەوە تەسەووف لە کوردستان سەری هەڵداوە وکۆمەڵە جیاجیاکان بە پەسەند کردنی ڕێبەرێکی هاوبەش لە باوەشی تەریقەیەکەدا یەك دەگرن. لە هەموویان کۆنتر کە تا ئێستاش لە کوردستان زۆر کارایە، تەریقەی قادری ونەقشەبەندیە.

لەگەڵ ئەوەی هزری تەسەووف پانتاییەکی فراوان دائەپۆشێت لە شیعرەکانی شاعیرانی کوردا بەڵام لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ شایەنی باس بێت نەکراوە لەسەر ((سۆفیگەریی مەولەوی)).

لەم توێژینەوەیەدا سەرەڕای گەڕان ووردبوونەوە لە دەقە شیعرەکانی مەولەوی وبەراوردکردنی لەگەڵ حاڵ ومەقام وزاراوە سۆفییەکان، لە بەشی یەکەمی توێژینەوەکەدا باسی تەسەووف و مێژووەکەی لە دینەکانی (ئیسلام، یەهوودی، مەسیحی، هیندۆسی) وسەرهەڵدانی قوتابخانە وڕێبازەکان باسکراوە.

پاشان لەبەشی دووەمدا باسی ژیان وکەسێتی وبەرهەمەکانی وخێزان ونەوەکانی وچەند سەرگوزەشتەیەك و مەولەوی لەدیدی ئەدیبیاندا کراوە کە دابەشکراون بەسەر چەند باسێکدا.

لەبەشی سێهەمدا باسی مەقام وحاڵەکان ومەی لەلای مەولەوی کراوە، پاشان باسی صلاَواتدان وپێغەمبەر وئیسرا ومیعراج ومرۆڤ دۆستی ولێبووردەی مەولەوی کراوە.

ئەمەش بریتیە لە پلانی توێژینەوەکەم:

بەشی یەکەم: سۆفیگەری پێناسە ومەدرەسەکان

باسی یەکەم: پێناسەی سۆفیگەری

باسی دووەم: مێژووی سۆفیگەری

لقی یەکەم: سۆفیگەری لای یەهودیەکان

لقی دووەم: سۆفیگەری لای مەسیحیەکان

لقی سێیەم: سۆفیگەری لای هیندەکان
لقی چوارەم: سۆفیگەری لای مسوڵمانەکان
باسی سێیەم: قوتابخانە ورێبازە تەسەووفییەکان
باسی چوارەم: هاتنی هەردوو ڕێبازی قادری ونەقشی بۆ کوردستان.
بەشی دووەم: مەولەوی ژیان وکەسێتی وبەرهەمەکانی
باسی یەکەم: کورتەیەك لەژیانی مەولەوی
باسی دووەم: شێوە وڕووخساری مەولەوی
باسی سێیەم: مەولەوی وعەشیرەتەکەی
باسی چوارەم: خێزان ونەوەکانی
باسی پێنجەم: چەند سەرگوزەشتەیەك لە ژیانی مەولەوی
باسی شەشەم: بەرهەمەکانی مەولەوی ویەکێك لەشاکارە ناوازەکانی
باسی حەوتەم: مامۆستا ومورشیدەکانی مەولەوی
باسی هەشتەم: مەولەوی لە دیدی ئەدیباندا
بەشی سێیەم: سۆفیگەری مەولەوی
باسی یەکەم: مەقامەکان لای مەولەوی
باسی دووەم: حاڵەکان لای مەولەوی
باسی سێیەم: مەی لای مەولەوی
باسی چوارەم: صلاّواتدان وپێغەمبەر ﷺ
باسی پێنجەم: ئیسرا ومیعراج
باسی شەشەم: مرۆڤ دۆستی ولێبووردەی مەولەوی

## بەشی یەکەم: سۆفیگەری ﴿پێناسە و قوتابخانەکانی﴾

- باسی یەکەم: پێناسەی سۆفیگەری.
- باسی دووەم: مێژووی سۆفیگەری.
  - لقی یەکەم: سۆفیگەری لای یەهودیەکان.
  - لقی دووەم: سۆفیگەری لای مەسیحیەکان.
  - لقی سێیەم: سۆفیگەری لای هیندەکان.
  - لقی چوارەم: سۆفیگەری لای مسوڵمانەکان.
- باسی سێیەم: قوتابخانە ورێبازە وتەسەووفییەکان.
- باسی چوارەم: هاتنی هەردوو ڕێبازی قادری ونەقشی بۆ کوردستان.

# بەشی یەکەم: سۆفیگەری ﴿پێناسە و قوتابخانەکانی﴾.

## باسی یەکەم: پێناسەی سۆفیگەری

### پێناسەی «سۆفیگەری» لە زمانەوانیدا:

وشەو زاراوەی «سۆفی» کە مەبەست و قەستە، زۆر ڕاڤە و شیتەڵکردن و لێکدانەوەی جۆراو جۆری، لەکایە وبوارەکانی «تەسەووف»دا لەسەر هەیە، ئەو ڕاڤە وشیتەڵکردنانەش بەگشتی لەزمانی زاناکانەوە باسکراوە و بۆمانیان گێڕاوەتەوە[1].

١- یەکێك لەو بۆچوونانە پێی وایە کە «صۆفی» لەوشەی «الصوف»ەوە وەرگیراوە کە وشەیەکی عەرەبییە وبەواتای «خوری» دێت، لەبەر ئەوەی بەهۆی لەبەرکردنی بەرگی خوریەوە ناوی سۆفی هاتوە چونکە لەبەرکردنی جل وبەرگی خوری ڕەوشتی پێغەمبەرەکان و وەلی و پیاو چاکانە[2].

کاتێ پیران، مەبەست لە پیرانی تەریقەتە، ئەو زاتانە لە کارکردنیاندا، لە کایە «سۆفیگەری» یەکانیان و وەختی زیکر وتەهلیلەبوونیان یان لەوەختی خەتمکردنیان لەو بوارانەدا، پۆشینی جل وبەرگیان «خوری- صوف» بووە[3].

هەر بۆ پاڵپشتی کردنی ئەم بۆچوونە کە «صۆفی» لە «صوف»ەوە هاتووە، لەکاتی وەفاتکردنی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی عومەر بەچەند وشەیەیێ لاواندیەوە ولەکۆتایدا گوتی "... ولبست الصوف وركبت الحمار وأردفت خلفك ووضعت طعامك على الأرض ولعقت أصابعك تواضعا منك ﷺ"[4].

---

(١) مشتێلە بیژەی عارفی وکردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، چاپخانەی ئەزمەڕ- سلێمانی، چ١، ساڵی ٢٠١٢ز، (ب١/ل ٨٦).

(٢) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، حققه، وقدم له، خرج أحاديثه: عبد الحليم محمود، طه عبد الباقي سرور، دار الكتب الحديثة- ميسر، ١٣٨٠ك-١٩٦٠ز، ل٤٠.

(٣) مشتێلە بیژەی عارفی وکردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل٨٧).

(٤) إحياء علوم الدين: أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي، دار المعرفة- بەیرووت، چ١، ٢٠١٤ز، (ب١/ل٣١٠)، و شرح الشفا: علي بن (سلطان) محمد، أبو الحسن نور الدين الملا الهروي القاري، دار الكتب العلمية- بەیرووت، چ١، ١٤٢١ك، (ب١/ل ١١٧)، ونهاية الإيجاز في سيرة ساكن الحجاز: رفاعة رافع بن بدوي بن علي الطهطاوي، دار الذخائر- قاهيره، چ١، ١٤١٩ك، ل٤١٦.

٢- یەكێكی تر لەو بۆچوونانە پێی وایە لەوشەی «الصُوفَة»ەوە وەرگیراوە كە وشەیەكی عەرەبییە و بەواتای «تیسكە خوری بێ كەڵكی تێ هەڵدراو» دێت، لەبەرئەوەی «سۆفی» لەبەرامبەر پەروەردگار وەك خوریەكی بێ كەڵكی هەڵوەشاوە دەبینێت، لە ملكەچ بوونی بۆ فەرمانەكانی خوای گەورە [(١)].

٣- یەكێكی تر لەو بۆچوونانە پێی وایە لەوشەی «صوفة القفاء»ەوە وەرگیراوە كە وشەیەكی عەرەبییە و بەواتای «ئەو موانەی كە لە كۆتایی پشتی سەر» دێت، لەبەرئەوەی «سۆفی» ڕوو لەحەق و پشت لە «خلق»ە[(٢)].

٤- بۆچونێكی تر پێی وایە كە لەوشەی «الصِّفَة»ەوە وەرگیراوە، لەبەرئەوەی «سۆفی»ییەكان وەسفدار دەكرێن بە ئاكاری بەرز و باش و وازهێنان لە كاری ناپەسەند و سەرزەنشتكراو[(٣)].

٥- بۆچونێكی تر پێی وایە كە لەوشەی «الصُّفَّة»ەوە وەرگیراوە، لەبەرئەوەی «سۆفی»ییەكان خۆیان بە شوێنكەوتن هاوڕیەتی كردنی ئەو كۆمەڵەیە هاوەڵە بەڕێزانە كە خەریكی زیكر و یادی خوای گەورە لە چینی گەدا وهەژارەكان بوون لە ناو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ئەمانەوە، كە پێغەمبەر ﷺ لە خواردن وخێر و زەكات وجل وبەرگی پێ ئەبەخشین[(٤)].

---

(١) حقائق عن التصوف: عبدالقادر عيسى، دار العرفان- سوريا، چ ١٦، ١٤٢٨ك – ٢٠٠٧ز، ل٢٠، وإيقاظ الهمم في شرح الحكم: احمد بن محمد بن عجيبة الحسنى، دار المعارف-قاهيره، ل٢٠.

(٢) تلبيس إبليس: جمال الدين أبو الفرج عبد الرحمن بن علي بن محمد الجوزي، دار الفكر للطباعة والنشر- بەيرووت، چ١، ١٤٢١ك- ٢٠٠١ز، ل ١٤٦.

(٣) إيقاظ الهمم في شرح الحكم: احمد بن محمد بن عجيبة الحسنى، ل٢٠.

(٤) حقائق عن التصوف: عبدالقادر عيسى، ل٢٠.

٦- یەکێکی تر لەو بۆچوونانە پێی وایە لەوشەی «الصَـف»ەوە وەرگیراوە کە بەواتای «پۆل، ڕیز» دێت، وەك ئەوەی لە ڕیزی پێشەوە بن بە دڵیان لەکاتی ئامادە بوونیان لە حزووری خوادا، وە پێشبڕکێ دەکەن لە هەموو خوا پەرستییەکدا[١].

٧- یەکێکی تر لەو بۆچوونانە پێی وایە لەوشەی «الصَـفاء»ەوە[٢] وەرگیراوە وشەیەکی عەرەبییە و بەرامبەرەکەی لە کوردیدا، لای سۆفی، کالاْی بەقەد بالاْی «دڵخاوێن»ی و«دڵپاك»ی یان «دڵپاکردنەوە» و«دڵ خاوێنکردنەوە» لە هەموو «غیلەوغەش»کردنێکی دنیایی دەگرێتەوە.. کە ئەو پاکوخاوێنکردنەوەی دڵ و دەروون بۆ هەموو شتە خراپەکانی دنیا، لای سۆفی بە بەهاترین سیفەتەکانی کارە سۆفیگەرییەکانیان دادەنرێ[٣].بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت "ذَهَبَ صَفْوُ الدُّنْيَا وَبَقِيَ كَدَرُهَا، فَالْمَوْتُ الْيَوْمَ تُحْفَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ" [٤].

٨- یەکێکی تر لەو بۆچوونانە پێی وایە لەوشەی «صفی، صفا»ەوە هەڵێنجراوە ولەوێشەوە دەیبەنەوە بۆ ڕەگ و ڕیشەی وشە و زاراوەی «مصطفى» «مستەفا» [٥].

---

(١) إيقاظ الهمم في شرح الحكم: احمد بن محمد بن عجيبة الحسنى، ل٢٠.

(٢) حقائق عن التصوف: عبدالقادر عيسى، ل٢٠.

(٣) مشتێلە بێژەی عارفی وکردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل٩١).

(٤) المصنف في الأحاديث والآثار: أبو بكر بن أبي شيبة، عبد الله بن محمد بن إبراهيم بن عثمان بن خواستي العبسي، المحقق: كمال يوسف الحوت، مكتبة الرشد – ڕیاض، چ١، ١٤٠٩ك، ژمارەی فەرموودە: ٣٤٥١٦، (ب٧/ل١٠٢).

(٥) مشتێلە بێژەی عارفی و کردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل٩٠-٩١).

**پێناسەی «سۆفیگەری» لە زاراوەی زانایاندا:**

سەبارەت بە پێناسەی سۆفیگەری لەلای زانایان پێناس گەلی زۆر هەن بۆیە لێرەدا تەنها ئاماژە بەچەند پێناسەیەك دەكەم، لەوانەش:

١. ئیمامی شافعی دەفەرموێت:"هاوڕێیەتی صۆفیەكانم كرد لە دوو شت كەڵكم لێوەرگرتن، ئەوانیش: كات وەكو شمشێرە ئەگەر نەیبڕی ئەتبڕێ، نەفس ئەگەر مەشغوڵی نەكەی بەحەق مەشغوڵت دەكات بەناحەق"[١].

وە هەروەها دەفەرموێت:"لە دونیادا سێ شت زۆر لام خۆشەویستە: وازهێنان لەداوكاری، هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ خەڵكیدا بە خۆشەویستی و لێبوردەی، شوێن كەوتنی ڕێگەی تەسەووف"[٢].

لە هۆنراوەیەكدا ئیمامی شافعی دەفەرموێت:

فـقيهاً وصـوفياً فكن ليسَ واحداً          فَـإنـي وَحَـقِّ اللَّهِ إيَّـاكَ أَنـْصَـحُ

فـذلـك قـاسٍ، لم يـذق قلبه تقى          وهذا جهولٌ،كيف ذو الجهل يصلحُ؟[٣]

واتە:          زانا و سۆفی بە، هەردوو، نە بەتەنیا یەك دانە

وا من بۆ خوا پێت دەڵێم، بە ئەو زاتی یەزدانە

ئـەمـەیـان دڵی ڕەقە، تەقوای پێ چێژ ناكرێ

ئـەوی تریان نەزانە، كوا نەزانیش چاك دەكرێ[٤]

---

(١) الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي: محمد بن أبي بكر أيوب الزرعي أبو عبد الله، دار الكتب العلمية – بەیرووت، ٢٠٠٩ز، ل ١٠٩، ومدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين: محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد شمس الدين ابن قيم الجوزية، المحقق: محمد المعتصم بالله البغدادي، دار الكتاب العربي – بەیرووت، چ٣، ١٤١٦ك- ١٩٩٦ز، (ب٣/ل١٢٤).

(٢) كشف الخفاء ومزيل الإلباس عما اشتهر من الأحاديث على ألسنة الناس: إسماعيل بن محمد العجلوني الجراحي، تحقيق: أحمد القلاش، مؤسسة الرسالة- بەیرووت، ١٤٠٥ك، (ب١/ل٤٠٨).

(٣) ديوان الشافعي: محمد بن إدريس الشافعي، المحقق: عبدالرحمن المصطاوي، دار المعرفة- بەیرووت، چ٣، ١٤٢٦ك-٢٠٠٥ز، ل٤٢-٤٣.

(٤) دیوانی ئیمامی شافعی(بەكوردی)، وەرگێڕان ولێكۆڵینەوەی: عزیز ئالانی، چاپخانە: شڤان-سلێمانی، چ١،٢٠١٤ز، ل١٠١.

٢. ئیمام ئەحمەد بەرلەوەی هاوڕێیەتی صۆفیەکان بکات ئامۆژگاری کورەکەی دەکرد کەخۆی خەریکی زانستی شەریعەت بکات وهاوڕێیەتی صۆفیەکان نەکات، پاشان کەبۆخۆی هاوڕێیەتی شوێنکەوتوانی ڕێبازی تەصەوفی کرد بەتایبەتی«ابوحمزة البغدادي»ئینجا بەکوڕەکەی ووت: "کوڕم لەسەرت بێ هاوڕێیەتی ئەم کۆمەڵە بکەی چونکە ئەوان پێش ئێمە کەوتوونەتەوە بەهۆی زۆری زانست وچاودێریکردن وتەزکیەکردنی نەفس وترسان لەخوا ودوونیا نەویستی"[(١)].

وە هەروەها دەفەرموێت:"هیچ تاقم وکۆمەڵێك شك نابەم لەوان باشتر بن، وتیان: خۆ ئەوان گوێ بۆ قەصیدە و موناجات دەگرن و حاڵیان لێ دێت؟ گوتی: لێیان گەڕێن ساتێك لەگەڵ خوای خۆیان خۆش ڕابوێرن!!" [(٢)].

٣. ئیمامی مالیك دەفەرموێت:"هەرکەسێك شەریعەتی زانی بەڵام شوێنکەوتەی تەصەوف نەبوو ئەوا دەبێتە«فاسق»، وەهەرکەسێك شوێنکەوتەی تەصەوف بوو بەڵام شەریعەتی نەزانی ئەوا دەبێتە«زەندیق»، وەهەرکەسێك هەردووکیانی کۆکردەوە ئەوا دەگاتە ڕاستی"[(٣)].

٤. ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموێت:"ئەبوعەلی دەقاق دەڵێ من ڕێبازی تەصەوفم لە«أبي القاسم النصر أباذي» وەرگرت وفێربووم ئەویش لە«الشبلی» وەرگرتووە، ئەویش لە «السري السقطي» وەرگرتووە، ئەویش لە«معروف الكرخی» وەرگرتووە،ئەویش لە«داود الطائي» وەرگرتووە، ئەویش لەئیمامی«ئەبوحەنیفە»ی وەرگرتووە وفێربووە، دەشڵێ هەموویان مەدحیان کردووە"[(٤)].

(١) تنوير القلوب في معاملة علام الغيوب: شيخ محمد امين الكردي الإربلي، دار الكتب العلمية- بەیرووت، چ١، ١٤١٦ك-١٩٩٥ز، ل٤٣٤.

(٢) غذاء الألباب شرح منظومة الآداب: محمد بن أحمد بن سالم السفاريني الحنبلي، تحقيق : محمد عبد العزيز الخالدي ، دار الكتب العلمية - بەیرووت، چ٢، ١٤٢٣ك-٢٠٠٢ز، ل١٢٠.

(٣) شرح عين العلم وزين الحلم: نور الدين ملا علي بن سلطان محمد الهروي المعروف بالقاري، مكتبة الثقافة الدينية- قاهیره، (ب١/ ل٣٣).

(٤) الرد المحتار على الدر المختار: ابن عابدين، محمد أمين بن عمر بن عبد العزيز عابدين الدمشقي الحنفي، دار الفكر- بەیرووت، چ٢، ١٤١٢ك – ١٩٩٢ز، (ب١/ل٦٠).

**٥. ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت:"بنچینەی تەسەووف پێنجن، ئەوانیش: خۆپاراستن لەتاوان چ بەئاشکرا چ بەنهێنی بێت، شوێن کەوتنی سوننەت لە گوفتار و ڕەفتاردا، دوورکەوتنەوە لە قسە وتن وباسکردنی دروستکراوەکانی خوا لە کاتی ئامادەبوونی خۆیان بێت یان لەپاشەملە، ڕازی بوون بە بەشی خوا وشوکرانەکردنی ڕۆزی لەکاتی زۆری و کەمی دا، گەڕانەوە بۆلای زاتی خوای گەورە لە تەنگانە و دڵخۆشی دا"[١].**

**٦. جونەیدی بەغدادی [٢]دەفەرمویت:"ڕێگای تەسەووف ناگیرێتە بەر، مەگەر کەسەکە کتێبەکەی خوا بەدەستی ڕاستییەوە بێت، وسوونەتەکانی پێغەمبەر بەدەستی چەپیەوە بێت، وبەدەست نوێژەوە ئەم ڕێگایە بگرێت، بۆئەوەی نەکەوێتە گومان وتاریکی داهێنراو لەدینادا"[٣].**

**٧. ئەبوو توراب ئەلنەخشەبی[٤] دەفەرمویت:"سۆفی لەجیهانی حاڵی تایبەتی خۆیدایە وپەیوەندی بەجیهانی مادییەوە نەماوە وهەوێنیشە بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو لێڵییەك"[٥].**

---

(١) المقاصد: الإمام النووي، المحقق: برهان محمد بدر الدين الشاعر، چ٣، ٢٠٠١ز، ل ٥٦.

(٢) جونەیدی بەغدادی: ناوی «الجنید بن محمد»ە، یەکێ لە زانایانی ئەهلی سوونە وجەماعەتە، سۆفیێکی پایەداری گەیشتوو بە پایەبەرزەکانی تەسەووفی سەدەی سێیەمی کۆچیە،ڕەچەڵەکی دەگەرێتەوە سەر شاری نەهەوەند لە ناوچەی هەمەدان، وەلێ لە بەغدادیدا لەدایکبووە لەتەمەنی «٢٠» ساڵیدا فتوای داوە و هاوەڵی بەشێ لە شێخانی کردووە. ناوبەنگی بە هاوەڵی خاڵی «سری سەقەتی» وحارسی محاسبـی دەرکردووە، دەرسی فیقهی لەلای ئەبی ثور خوێندوە، لە ڕۆژی شەممەی ساڵی ٢٩٧ی کۆچی وەفاتی کردووە. {طبقات الأولیاء: ابن الملقن سراج الدین أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري ،تحقیق: نور الدین شریبە من علماء الأزهر، مکتبة الخانجي- قاهیرە، چ٢، ١٤١٥ك – ١٩٩٤ز، ل ١٢٦}.

(٣) تذکرة الأولیاء: شیخ فرید الدین العطار نیشابوری، تحقیق: أحمد آرام، ل ٤٣٢ .

(٤)ئەبوو توراب ئەلنەخشەبی: ناوی «عسکر بن حصین التخشبـي»یە، لە شێخە مەزنەکانی خوراسان بووە وخەڵکی شارۆچکەی «نخشب» بووە، دەڵێن لەبیابان مردووە و داڵ پارچە پارچەی کردووە لە ٢٤٥ کۆچی.{الرسالة القشیریة: عبد الکریم بن هوازن بن عبد الملك القشیري ، تحقیق: عبد الحلیم محمود، محمود بن الشریف، دار المعارف- قاهیرە، ٢٠١٠ك، (ب١/ل٧٠)} .

(٥) الرسالة القشیریة: عبد الکریم بن هوازن بن عبد الملك القشیري، (ب٢/ل٤٤٣) .

**٨. ئەبوولحسێن نووری[١] دەربارەی تەسەووف دەڵێت:"تەسەووف نە زانیارییە و نە ڕەسمە[٢]، بەڵکو ئەخلاقی خوداوەندیە، چونکە ئەگەر ڕەسم بووایە بە تێکۆشان دەهاتە دەست، وە ئەگەر زانیاری بووایە بەخوێندن فێری ئەبووین، بەلاّم ڕازاندنەوەیە بە ڕەفتاری خوداوەند، وە کەسیش ناتوانێت لەڕێگەی خوێندن وتێکۆشانەوە ببێتە خاوەنی ئەو ڕەفتارە، مەگەر بە پەیڕەوکردن لە ڕەفتارەکە"[٣].**

**٩. ئەبووبەکری ئەلکەتتانی[٤] دەربارەی تەسەووف دەڵێت:"التصوف صفاء ومشاهده" واتە: تەسەووف خاوێنی ودیتنە[٥].**

**وەهەروەها دەڵێت:"تەسەووف هەمووی ڕەوشتە ئەوەی ڕەوشتی بەرزتر و زۆرتر بوو ئەوە تەسەووفییەکەی زۆرتر و بەرزترە"[٦].**

**١٠.شێخ عبدالقادر گەیلانی دەفەرمووێت:"التصوف هو الصدق مع الحق مع الخلق" واتە: تە صەووف ڕاستی یە لەگەڵ زاتی خودا وشیرینی ئەخلاقە لەگەڵ مرۆڤدا[٧].**

**١١.مەعروفی کەرخی دەفەرموێت:"تەسەووف پەیڕەوکردنە لە ڕاستیەکان ودوورە پەرێزی کردنە لەو شتەی کە بەدەستی خەڵکە"[٨].**

---

(١) ئەبوولحسێن ئەلنووری: ناوی «أحمد بن محمد النوري البغدادي»یە، لەکاتی خۆی چاکترین تەریقەتی هەبووە و زۆر قسە خۆش بووە، هاوڕێی «سري سقطي وجنيد» بووە لە پێش جونەید مردووە لەساڵی ٢٩٥ کۆچی، ئەلنووری ئەدرێتە پاڵ «نور»ی شاری «بلیدە»ی نێوان بوخارا و سەمەرقەند، وە وتراویشە بۆیە پێی دەوترێت ئەلنووری لەبەر جوانی ڕووخسار وسیمای {طبقات الأولياء: ابن الملقن سراج الدين أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري، ل٦٢}.

(٢) واتە: داب ونەریت.

(٣) تذكرة الأولياء: فريد الدين العطار نيشابوری، ل٤٧٣.

(٤)ئەبووبەکری ئەلکەتتانی: ناوی «أبو بكر محمد بن علي الكتاني»یە، خەڵکی بەغدادە و هاوڕێی جونید وخەراز ونووری بووە و لەشاری مەککە بووە تا وەفاتی کردووە لە ساڵی ٣٢٢ کۆچی. {الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب١/ل١٢٣)}.

(٥) تذكرة الأولياء: فريد الدين العطار نيشابوری، ل ٥١٣ .

(٦) طبقات الأولياء: ابن الملقن سراج الدين أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري، ل١٤٥.

(٧) ديوان عبد القادر الجيلاني(دراسة اسلوبية): عبدالله خضر حمد، دار القلم- بەيرووت، ٢٠١٧ز، ل٤٩.

(٨) الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب٢/ل٤٤١) .

**١٢. ئەبوو محەمەد ئەلجەریری**[١] لێیان پرسی تەسەووف چییە؟ وتی:"پەیڕەوکردنە لەهەموو ڕەوشتێکی پەسەند وە دوورکەوتنەوەیە لەهەموو ڕەفتارێکی زشت وناپەسەند"[٢].

**١٣. ئیبن نەجید**[٣] دەفەرموێت:"تەسەووف ئارامگرتنە لەژێر فەرمان پێکراوەکان ونەهی لێکراوەکان «الأمر والنهي»"[٤].

**١٤. ئیمامی غەزالی دەفەرموێت:"تەسەووف نەهێشتن ولادانی ئەو شتانەی کەئەبنە ئازار بۆ نەفس، وەپاراستنی لە ڕەوشتە ناپەسەندەکان وتایبەت مەندیە پیسەکان، هەتاوکو بگاتە ئەوەی دڵ پاك ببێتەوە وهەموو شتەکانی لێ وەدەر بنرێت جگە لەخوای گەورە، دڵیش بکرێتەوە بەهۆی زیکر ویادی خوای گەورەوە"[٥].**

## باسی دووەم: مێژووی سۆفیگەری

**تەسەووف بابەتێکی دێرینی چڕو بەیەکا چووە، سەرەتاکانی بۆ پەیدابوونی ژیان دەگەڕێتەوە لەسەر ئەم زەوییەدا، وەنەبێ تەنیا بەئیسلامەوە بەند بێ ولەوەوە ڕێچکۆڵەی کردبێ، بەڵکو دارێکی هێندە**

---

(١) ئەبوو محەمەد ئەلجەریری: ناوی «أحمد بن محمد الجريري»یە، نسبەتی وەلای «جرير بن عباد»ە، وبرای «الحارث بن عباد» وکونیەکەی «أبا محمد»ە، یەکێکە لە هاوڕێ گەورەکانی جونید وهاوڕێیەتی سەهلی توستوری کردووە و لەساڵی ٣١١ کۆچی وەفاتی کردووە. {طبقات الأولياء: ابن الملقن سراج الدين أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري، ل٧١}.

(٢) الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب٢/ل٤٤١) .

(٣) ئیبن نەجید: ناوی ئەبو عەمرو ئیسماعیلی کوڕی نەجیدی کوڕی ئەحمەدی سەلەمی یە، یەکێك بووە لە پێشەواکانی سەردەمی خۆیی، گوێی بۆ فەرموودە گرتووە بە ناوی گێڕەرەکەوە وسەنەدەکەیەوە وباوەڕپێکراو بووە، یەکێك لە وتەکانی فەرموویەتی: هەرکەس بتوانێ خۆی دارنێت لە ناوبانگی وشۆهرەت وخەڵکی ئەوا زۆر ئاسانە بۆی پشت لەدنیا وئەوەیشی تێدایە بکات، وەفاتی کردووە لە ساڵی ٣٦٦ی کۆچی. {طبقات الصوفية: أبي عبد الرحمن السلمي تحقيق: نور الدين شربية، مطبعة المدني- میسر، چ٣، ١٩٨٦ز، ل ٤٥٤- ٤٥٨، والطبقات الكبرى: إمام عبد الوهاب الشعراني، ضبطه وصححه: خليل المنصور، دار الكتب العلمية- بەیرووت، چ١، ١٩٩٧ز، (ب١/ل١٢٠)} .

(٤) الاستقامة: أبي العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، تحقيق: محمد رشاد سالم، جامعة الإمام محمد بن سعود، مەدینەی منەوەرە، چ١، ١٤٠٣ك، (ب١/ل٩٩).

(٥) المنقذ من الضلال: أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي، بقلم: عبد الحليم محمود، دار الكتب الحديثة-میسر، چ٦، ٢٠١٠ز، ل١٧٠.

بەناخا چووی ژیانە ڕەگ وڕیشۆڵەکانی گەلیٚ شوێنی گرتۆتەوە بە تایبەتی لەناو ئەو گەلانەی کە خاوەن ژیاری کۆنن[(١)].

بۆچوونی جیاواز هەیە سەبارەت بە دەرکەوتن وبەکارهێنان وپێناسەی وشەی «تەسەووف»، هەروەك ئیبن تەیمیە وئیبن لجەوزی وئیبن خەلدونیش دەڵێن دەستەواژەی «سۆفی» نەناسراوە هەتا سەدەی سێیەمی کۆچی، بەلاٚم دواتر ناسراوە، وەهەروەها لە یەکێك لە زاناکانی ئومەت ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وەرگیراوە، وەهەروەها لە ئەبی سەلمانی دارانی وغەیری ئەویش وەرگیراوە، وە گێرانەوەیەکی «سوفیانی سەوری» هەیە کە قسەی لەبارەوە کردووە، هەندێکیش ئەڵێن لە شێخ حەسەنی بەصری وەرگیراوە[(٢)].

کۆمەڵێك لە نووسەرانی تەسەووف بەتایبەتی لە ڕۆژهەلاٚتناسەکان لەو باوەڕەدان کە تەسەووف لەبنچینەوە لەگیانی ئیسلام دوورە وبەڕێگای فارسەکانەوە لەهیندیان وەرگرتووە هەندێکیش دەڵێن لەو کاتە پەیدا بووە کە مسوڵمانەکان ئێرانیان خشتە ژێر دەسەلاٚتی خۆیان و لەڕووی سەربازییەوە فارسەکان شکان، واتە بەرتەکدانەوەی ئارییەکانە دژی سامییەکان، ئینجا پەنایان بردە بەر گۆشەگیری لەگەڵ بیروباوەڕی پێشوویان دەگونجا، رای تریش هەیە پیٚ لەسەر ئەوە دادەگریٚ کە ڕەبەنایەتی مەسیحیەکان کارێکی زۆری کردە سەر سۆفیگەری ئیسلامی[(٣)].

«ثولك» لەو باوەڕەدایە کە "تەسەووفی ئیسلامی لەبنەمایەکی مەجووسییەوە وەرگیراوە بە بەڵگەی ئەوەی کە زۆر لەو مەجووسییەکان لەسەرووی ئێران کە هەر لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە دوای هاتنی مسوڵمانەکان بۆ ئێران، هەروەها زۆر لە گەورە سۆفییەکان لەو ناوچەیە بوون، ئەو بیر وباوەڕە هیندییانەی کە لە وتەی هەندیٚ لە سۆفییەکان دەبیستریٚ، لەو ناوچەیەی ئێرانەوە هاتووە و تیپە تەسەووفییە سەرەتاییەکانی مەجووسی دایانمەزراندووە یان شارەزای مەجووسییەت بوون"[(٤)].

---

(١) المدخل إلى دراسة الأديان والمذاهب: عبدالرزاق محمد اسود، الدار العربية للموسوعات- بەیرووت، چ١، ١٩٨١ز، (ب٢/ل٧٠).

(٢) التصوف .. المنشأ والمصادر: إحسان إلهي ظهير الباكستاني، إدارة ترجمان السنة، لاهور – پاكستان، چ١، ١٤٠٦ك – ١٩٨٦ز، ل٤٠، و رسالة في الصوفية والفقراء: ابن تيمية، قدم لها: محمد جميل غازي، دار المدني- قاهيرە، ل١٣.

(٣) نشأة الفلسفة الصوفية وتطورها: عرفان عبدالحميد فتاح، دار الجيل- بەیرووت، چ١، ١٤١٣ك- ١٩٩٣ز، ل٥.

(٤) تأريخ التصوف الاسلامي: عبدالرحمن بدوي، وكالة المطبوعات- كووەیت، چ٢، ١٩٧٨ز، ل٣١، والتصوف .. المنشأ والمصادر: إحسان إلهي ظهير الباكستاني ل٩٨.

«الفرد فون گریمر» لەو باوەڕەدایە کە "زوهدی ئیسلامی لەمەسیحییەکانەوە وەرگیراوە و دوای ئەمە بەهۆی «رابعة العدویة»ەوە لەگەڵ خۆشەویستی خواییدا تێکەڵ کراوە وتەسەووفیش لە دوو ڕەگەزی مەسیحی و هیندی بووذی پەیدابووە"[1].

«نیکڵسۆن» لەبارەی تەسەووفی ئیسلامییەوە دوو بۆچوونی هەیە لەسەرەتادا باوەڕی وابوو کە دەقاو دەق لەفەلسەفەی نوێی ئەفلاتوونی هاتووە، بەڵام لە ساڵی ۱۹۲۱ز، هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە ناڕەوایە تاکە سەرچاوەیەك دەستنیشان بکرێ و بەگشتی تەسەووفی ئیسلامی لەنێو بیر وباوەڕە جیاوازانەوە هەڵقولاوە کە تێکەڵی مسوڵمانەکان بووە، واتە هەر گەلێك بووەتە مسوڵمان هەندێ لەبیر وباوەڕی کۆنی خۆی هێشتووەتەوە و کردوویەتیە بە هەوێنی تەسەووفی ئیسلامی[2].

«زەکی موبارەك» ئیسلامی کردووەتە سەرچاوەی تەسەووف کە قورئانی بەنزیکترین سەرچاوەی تەسەووف داناوە ئەو کتێبەکەی بەدرێژی سەرزەنشی جیهان دەکات و بەشتێکی پووچی داناوە، هەروەها ژیانی پێغەمبەر ژیانێکی سۆفیانە بووە ورجێگای خەوتنەکەی تەنها حەسیرێکی ڕەق بووە[3].

(۱) تأریخ التصوف الاسلامي: عبدالرحمن بدوي، ل۳۲، والتصوف .. المنشأ والمصادر: إحسان إلهي ظهیر الباكستاني ل۷۹.

(۲) الصوفیة في الإسلام: نیكلسون، ترجمه وعلق علیه: نورالدین شربیه، مكتبة الخانجي- قاهیره، چ۲، ۱٤۲۲ك-۲۰۰۲ز، ل۱۲.

(۳) التصوف الإسلامي في الادب والاخلاق: زكي مبارك، دار الجیل - بەیرووت ، چ۱، ۱۹۷۳ز، ل۹.

## لقی یەکەم: سۆفیگەری لای یەهودیەکان

ئاینی یەهوودی یەکێکە لەو ئاینە ئاسمانییە گەورانەی کە لەپێش ئاینی مەسیحی و مسولمانەوە هاتووە، و گەلی پێغەمبەر موسان ﷺ، کتێبە ئاسمانیەکەیان ناوی «التوراة»ە، یەکەم کتێبی ئاسمانییە کە دابەزێنرابێتە سەر زەوی بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بهێنرێت، واتە نە بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ و نە بۆ هیچ پێغەمبەرێك لە پێشدا شتێك دانەبەزیووە کە ناو ببرێت بە کتێب(١).

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت ﴿نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۝٣ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلْفُرْقَانَ ۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ۝٤﴾ ﴿آل عمران: ٣-٤﴾.

بێگومان شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی دەقەکانی تەورات، چ شیکارێك وڕاڤەکردنی حاخامەکان یان تایبەت بێت بە شیکاری «کابالایی»، بەدرێژایی چەندین سەدەی ڕابردوو ئاوێتەی بیر وفکری یەهوودی بووە، وکاری لەسەرکراوە لە چوارچێوەی ڕەخنەگرتن و ڕوونکردنەوە وشیکارکردنەوە(٢).

{ القبالاه یاخود «کابالا» یاخود «تەسەووفی یەهوودی» بە عیبری«קַבָּלָה»بە مانای «گەیشتن بە داهاتوو»دێت: بریتیە لە تەفسیر وڕاڤەکردنی تەورات بەمانایەکی شاراوە «باطن»ی نەك دیار«ظاهر»ی بۆ دەقەکانی تەورات، بیروباوەڕێکی ڕۆحانی جووەکانە ومەزهەبێکی سۆفیگەری توندڕەوی یەهوودی یە، کە شیکردنەوەی پەرتووکی پیرۆزیانە!! لەسە بناغەی ئەوە درووست بووە کە هەموو ووشەیەك و هەموو پیتێك نهێنی یەکی لە پشتەوەیە! بنەچەی ئەم فێرکردنانە بۆ بابلیی کۆن دەگەڕێتەوە و پەیامەکانی بۆ هەزاران ساڵە پارێزگارییان لێدەکرێت. وەکابالا لە ئیسپانیا وباکووری فەڕەنسا لەنێوان سەدەی دوانزەیەم وپانزەیەمی زاینی دەرکەوتوو وبلاوبوویەوە، وەسەرئەنجام لەشاری «صفد» لە فەلەستین لە سەدەی سیازدەی زاینیدا بلاوبوویەوە.

---

(١) الملل والنحل: محمد بن عبد الكريم بن أبي بكر أحمد الشهرستاني، تحقيق: محمد سيد كيلاني، دار المعرفة - بەيرووت ، ١٤٠٤ك، (ب١/ل٢٠٩).

(٢) الفلسفة الالمانية والتصوف اليهودي: يورغن هابرماس، ترجمة وتقديم: نظير جاهل، المركز الثقافي العربي، دار البيضاء- بەيرووت ، چ١، ١٩٩٥ز، ل٦.

وه بە کابالا دەوترێت «قواعد الغيبيات – یاسا پەنهانەکان» لەبەرئەوەی دادەنرێت بەجیاکەرەوەیەك لەنێوان شتە بینراو «ظاهر»ەکان لەدنیا وتەوراتدا، وشتە نەبینراو«باطن»ەکان لە نێوان هەر دووکیاندا.

لەبەرئەوەی تەورات دوو واتای هەیە: واتایەکی ئاشکراو دیار کە هەموو کەسێکی ئاسایی جوولەکە ئەتوانێت لێیان تێ بگات وشیکاریان بکات لەڕێگای ژیری وکەلتووری یەهوودییەوە، هەروەها واتایەکی تری هەیە شاراوە وپەنهان ونهێنی وئاڵۆزە لە جیهان وتەورتدا، کە ئەمەش بریتیە لەنهێنیەکانی ناو تەورات، کە هەموو کەس ناتوانێ لێیان تێ بگات جگە کەمێك نەبێت لەوانەی کە عارف وزانان بە سڕ ونهێنیەکان.

سەرچاوەی ئەم ڕێچکەیە بریتی یە لە کتێبی دروست کردن «کتاب الخلق» یا بە زوهار «الزوهار» بە پێی ڕێچکەو وکتێبەکانیان ئەو ووشانەی بەکارهاتوون دەلێن هەر وشەیەك مانا و نهێنی تایبەتی خۆی هەیە کابالا بە ئاڵۆزترینی فەلسەفەکانی ئاینی لێکدەدرێتەوە کە بریتیە لە قوڵای نیشانە و هێمای سەیر و تاریك و زۆر ورد سروشتی خوا و گەردوون.

ئەوانەی توێژینەوە لەسەر ڕێبازەکە دەکەن، دەڵێن کەبالای بریتییە لە دانایی کۆن کە کارەکانی ژیان و گەردوون ئاشکرا دەکات}[1].

کابالا لەسەر«١٠» بنەما پێکدێت کە پێی دەڵێن درەختی کابالا کە نیشانەی«١٠» هێزە کە کاریگەرییان لەسەر جیهان هەیە، ئەوانیش بریتین لە:

١. کتێر «Keter»: واتە «تاجی ئاسمانی» لە بەشی سەرەوەی داری کابالایە، وبە هۆشیاری وزیرەکیەك لەسەرو توانایەکی ئاساییەوە ناسراوە، بۆیە بە «تاج» ئەناسرێت چونکە تاج ئەکرێتە سەر، وەسەریش جێگای مێشك و هۆشە، وخاوەنی پەنهانترین پلەیەی داری کابالایە[2].

---

(1) https://www.marefa.org/قبالة_(يهودية)

https://www.ehtelalnews.com/القبالاه-والمُتصوفة-اليهود/

(2) The Palm Tree of Devorah, Rabbi Moshe Cordovero ZTKL, Tomer Devorah, Chapter II, Page 14.

٢. خوشما «Chochma»: بەرزترین جیگای بیرۆکەیە، واتە دووەم پلەی داناییە و لەدوای کتیر «Keter»ەوە دێت، وبەمە مرۆڤ ئەتوانێ بیر لە هێز وتوانای خوا بکاتەوە[١].

٣. بیناه «Binah»: واتە «ژیرانە تێ گەیشتن» بۆ هەستپێکردنی توانینی کەسەکان بەکاردێت، وە تایبەتە بە توانین وهێزی ڕۆحەکان، ئەم بەشە بەلای ئەوانەوە بۆ لەبەرگرتنەوەی ڕۆحەکان و هێز وتوانینی ڕۆحەکان بەکار دەهێنرێت، پێیان وایە کە خوا بەندە تایبەتەکانی فێر ئەکات چۆن ڕۆحی کەسەکان بگوازنەوە بۆ یەکتری[٢].

٤. دات «Daat»: واتە «ژیری و زانین» مرۆڤ بە بۆچوونی ئەوان بەم بنەمایە دەتوانێت لە ڕێگەی ژیری«عەقڵ»یەوە پەی بە نوورەکانی خوا ببات و نوورەکانی خوا دەربخات لە ناخی کەسەکەدا و ئەو مرۆڤ تەنها خودی خۆی هەستی پێ ئەکات، واتە هەموو مرۆڤێك ناتوانێت هەستی پێ بکات، وەك ڕووناکیەك وایە خۆپەرستی ناهێڵێت لە مرۆڤدا، هەرکات خۆپەرستی دەرکەوت ئەوا ئەو نوورانە دەکوژێنەوە[٣].

٥. خسید «Chesed»: واتە «خۆشەویستی وبەزەیی»، هەروەها پێی دەوترێت «کیدولا» بەمانای «گەورەی دێت»، بۆیە پێویستە لەسەر هەر تاکێك وەك چۆن خۆشەویستی هەیە بەرامبەر بەخوای گەورە، بەهەمان شێوەش بەزەیی هەبێت بەرامبەر بچوك ومنداڵەکان لە ئیسرائیل، بەمەش جیهان باشتر دەبێت[٤].

٦. {دن «Din»: واتە «دادپەروەری» یان «کیفوراGevurah» واتە: «هێز» یان «باشات» واتە: «ترس»، بریتیە لە یەکێك لە دە بنەماکەی کابالا.

٧. تفیریت «Tif'ert»: یان رحیم بە مانای سۆز ومیهرەبانی دێت.

٨. نیتزاخ «Necah»: واتە سەرکەوتنی هەمیشەیی.

---

(1) Meditation and Kabbalah: Aryeh Kaplan, Schocken books New York, Page 34.

(2) Everything You Want to Know About Magick: But Were Afraid to Ask,Scanlon, Shawn Martin,1972, Chapter III, Page 72.

(3) Little Essa Ys Tow Ard Truth: By Aleister Crowley, Page 18.

(4) Meditation and Kabbalah: Aryeh Kaplan, Schocken books New York, Page 113.

**٩. هود «Hod»: واتە شكۆ وگەورەی.**

**١٠.يسود «Jesod»: واتە بنەما، هەروەها {ملخوث «Malchut»: واتە مەملەكەتی خوایی «ڕەببانی»}یش دەخەنە پاڵ يسود ، بەلاّم هەندێك دەيكەنە يانزە بنەما}[١].**




(1) The Palm Tree of Devorah, Rabbi Moshe Cordovero ZTKL, Tomer Devorah, Chapter VI, Page 29.

## لقی دووەم: سۆفیگەری لای مەسیحیەکان

مەسیحیەکان یاخود «نصارا» ئوممەتی پێغەمبەر «عیسای کوڕی مریەم»ن ﷺ، لەدوای حەزرەتی موسا ﷺ خوای گەورە ناردوویەتی بۆ خەڵکی تاوەکو خەڵکی بۆلای یەکتاپەرستی بانگ بکات، وە کتێبی ئینجیلی بۆ هاتووە، وهەر بە منداڵی خوای گەورە هیناویەتیە قسەکردن، بە ویستی خوای گەورە مردووی زیندوو ئەکردەوە و کوێر و بەڵەکی چاك ئەکردەوە[1].

مەسیحیەکان بیر وباوەڕیان بە سێ خوا هەیە، وپێیان وایە پێغەمبەر عیسا لەخاچ دراوە لەپێناو لێخۆش بوونی تاوانی ئادەم، هەروەها بۆچونیان وایە کە پێغەمبەر عیسا لێپرسینەوە لەخەڵك ئەکات لە ڕۆژی دواییدا[2].

تەسەووفی مەسیحی لەڕووی زمانەوانی وزاراوەوە:

{لێکۆڵەرەوە ڕۆژئاواییەکان دەڵێن دەستەواژەی «تەسەووفی مەسیحی» هیچ پەیوەندیەکی بەزمانی عەرەبییەوە نیە، بەڵکو لەزمانی ئینگلیزیەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە، دەڵێن لە وشەی «Mysticism» وەرگیراوە، کە ئەویش لە وشەی «Myein» ی ئیغریقی وەرگیراوە بەمانای پێدان و فێرکردنی بناغە وبنەمای هونەرێك یان بابەتێك بە کەسێکی نەشارەزا، و داخراوە و کەس نایزانێت، پەیوەندیەکی زمانەوانی لەگەڵ ئەم سێ وشەیە هەیە کە «Myth»، کە بەمانای ئەفسانە وخەیاڵ و «Mysticism»: بەمانای تەسەووف دێت، «Mystery»: بەمانای شاراوە وئاڵۆز وسەیروسەمەرە وپەنهان دێت، هەموو ئەمانە لە ووشەی یۆنانی «Musteion» وەرگیراوە کە بەمانای داخستنی هەردوو چاو ودەم دێت، پەیوەیەندیان بە تاریکی «Darkness» و بێ دەنگ بوون «Silence» هەیە.

هەروەها دەستەواژەی «مستیسم» بەچەندین مانا لێکیان داوەتەوە، لەوانە «الثیوصوفي» یان ڕاڤە وتەفسیری مەجازی کتێبی موقەدەس«ئینجیل» لێکداوەتەوە، وەهەروەها هەموو ئەو شتە نهێنی و پەنهانانە کە لەسەرووی توانا وویست وژیری مرۆڤەوە ئەچنە ژێر ناوی تەسەووف «Mysticism» ەوە، بەگوێرەی بەکارهێنانی مەسیحیەکان.

---

(١) الملل والنحل: محمد بن عبد الكريم بن أبي بكر أحمد الشهرستاني، (ب١/ل٢١٩).

(٢) تخجيل من حرف التوراة والإنجيل: صالح بن الحسين الجعفري أبو البقاء الهاشمي، المحقق: محمود عبد الرحمن قدح، مكتبة العبيكان- رياض، چ١، ١٤١٩ك-١٩٩٨ز، (ب١/ل٥٨).

ئەم پێناسە زمانەوانیانە پەیوەندیەکی بتەوی هەیە بە مانا زاراوەکەیەوە کە لەلای زانا لێکۆڵەرەوە ڕۆژئاواییەکانەوە بلاّوە، وەك «سکۆت» دەڵێت: تەسەووف بریتیە لە ئەفسانەیەکی ڕۆحی، وسۆفی ئەو کەسەیە کە باوەڕی بەو ئەفسانە ڕۆحیە هەیە.

ئەو پێناسەی کە لەلای مەسیحیەکان بەکاری دەهێنن بۆ خۆیان:

١. تەسەووف بریتیە لە هەستکردن بە تەنها بوون لەگەڵ خوادا.

٢. تەسەوف بریتیە لە هەوڵدان بۆ ناسینی خوا بەبێ هۆکار وواسیتە و قسەکردن لەگەڵ خوادا ڕووبەڕوو.

٣. تەسەووف بریتیە لە پەیوەندیکردن بە بێ کۆتاکان و دەرچوون لەگەردوون «واتە یەککگرتن لەگەڵ خوادا Godhead» لە ئەنجامی ئاوێتە بوونی لاهوت لە ناسووت دا واتە تێکەڵ بوون ویەککگرتنی خوا و عیسا، بەمە ئەوان ئاسودە بوون و تەواو بەرجەستە بووە لە بیروباوەڕی مەسیحیەکان}[1].

دەستەواژەی سۆفی بەو کەسانە وتراوە کە وازیان لە چێژ ولەزەتی ژیان هێناوە، وخۆیان تایبەت کردووە بەکار وکردەوەی چاکە، وگۆشەگیری وئومێد، ئەمە پەیوەندی نیە بە تەسەوفی ئیسلامی، ڕێچکەی تەسەووف لەگەڵ ئەوەی کەجیاوازی لە ڕێبازەکانیاندا هەیە چ ئاینە ئاسمانیەکان وئاینە زەمینیەکاندا، بەلاّم لە هەموویان لە یەك بنەمادا یەکدەگرنەوە ئەویش بریتیە لە خۆشەویستی و دنیانەویستی وتێڕامان لە گەردوون بۆ گەیشتن بە زاتی خوا، وە سۆفییەکان هەموو ئەو هەست وسۆزانەی خۆیان دەربڕیوە لەڕێگەی هۆنراوە وئەدەبیات ویادەوەرەیەکان وئەو کتێبانەی تایبەتن بە تەسەووفەوە، ئیتر چ مسوڵمان بن یان مەسیحی[2].

ئەزموونی سۆفێتی یەکێکە لەلای هەموو سۆفییەکان، تەسەوفیش لەناو مەسیحی ومسوڵمان ویەهوودی و هیندۆسی و بوذي دا هەیە، هەرچەند هەموویان شوێنکەوتەی یەك بیر وباوەڕ وعەقیدەی

---

(١) وتارێك بە ناونیشانی ("التصوف في المسيحية" طريق الذاهبين إلى الله) نوسینی: مایکل عادل، لەبەرواری (١٣/دیسمبر/٢٠١٧) لە پێگەی (البوابة نيوز): http://www.albawabhnews.com/2847833 .

(٢) مدخل لدراسة التصوف، الشعر الصوفي في: (القرن السابع الهجري، و العصر المملوكي الاول، و العصر العثماني): علي حيدر، دار الشموس- دیمەشق، چ١، ١٩٩٩ز، ل٣٧.

دیاریکراو نین، بەلاّم هەموویان جیاوازن لە تەئویلکردنی ئەزموونەکانیان بە تەئویلێکی عەقڵی پشت پێ بەستراو بە پێی تایبەتمەندی ڕۆشنبیری خۆیان[1].

لەسەدەی چوارەمی زایینەوە «فلمون» بە ئاشکرا دەستووری ڕەبەنایەتی فێری قدیس «باخوم» کرد ویاساکانی دەستنیشان کرد کە بریتی بوون لە چەند وتەیەکی کورد لەبارەی ڕەفتار وهەڵس وکەوت ورەوشتی ڕەبەنەکان لەدێره و کاتی نوێژکردن وگەشت وخوان دانان و سەرەڕای هەندێ ئامۆژگاری گیانی[2].

«القدیس پۆڵس» دەڵێت: "جا ئەوەی دەمێنێتەوە لە بەگەورە دانانی خوای گەورە، باوەڕ وهیوا وخۆشەویستیە، ئەمانە سێ شتن، بەلاّم خۆشەویستی لەهەموویان مەزنترە"[3].

## ڕێگاکانی گەیشتن بە خوای گەورە لای تەسەووفی مەسیحەیەکان:

- خەڵوەت و گۆشەگیری:

گۆشەگیر بوون وبەندایەتی بۆ خوای گەورە بەتەنهایی یەکەم هەنگاوە بۆ گەیشتن بەخوای گەورە، «المعمدان» و«پۆڵس» لە یەکەمینی خواپەرستەکان ونەویستنی دنیا وچێژ ولەزەتەکانی دێنە هەژمار، ناسراوترین سۆفییەکانی ناو مەسیحیەت لەدوای پێغەمبەر مەسیح بریتین لە مارئامون ومار أنطونیوس، وأنبا بولا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمان بەخۆیان نەوتووە سۆفی، بەڵکو باوەڕیان بەوە هەبووە کە خۆیان لە ماددیگەرای و دنیا پەرستی و چێژەکانی دونیا هەڵبێن و لە جیهانی ماددەوە بچنە جیهانی

---

(١) التصوف والفلسفة: ولترستیس، ترجمه وتقدیم: عبدالفتاح إمام، مكتبة مدبولي- قاهیره، چ٢، ١٩٩٩ز، ل٩.

(٢) ابن عربي حیاته ومذهبه: أسین بلاثیوس، ترجمة: عبدالرحمن بدوي، مكتبة الأنجلو المصرية- قاهیره، ١٩٦٥ز، ل١٢٢.

(٣) ئینجیلی پیرۆز (مزگێنی پەیمانی نوێی حەزرەتی عیسا)، بەشێوەی کوردی سۆرانی، چ٢، یەکەم نامەی پۆڵس بۆ باوەڕدارانی کۆرنسۆس، (١ کۆرنسۆس ١٣:١٣)، ل٤٧٣، والكتاب المقدس العهد الجديد (١ كورنثوس ١٣:١٣)، وموسوعة المعرفة المسيحية الحياة الروحية المبسطة (٣): الأب سامي حلاق يسوعي، دار المشرق- بەیرووت، ٢٠١٢ز، ل٧، ومفهوم الآخر في اليهودية والمسيحية: رقية طه جابر العلواني وآخرون، دار الفكر- دیمەشق، چ١، ٢٠٠٨ز، ل١٢٢ .

**ڕۆحی، پاشان ئەزموونەکانیان گواستووەتەوە بۆ خوێندکارەکانیان وەك مەتتای هەژار، ئەمەش لەم بوارەدا ناسراوە بەبێ ئەوەی ناوی خۆی بنێت سۆفی[1].**

**حەزرەتی عیسا زۆرجار گۆشەگیر بووە و بەتەنها نوێژی لە شاخەکان کردووە، لە ئینجیلی لۆقا هاتووە کە "عیسا بە ڕۆژ لەپەرستگا خەریکی فێرکردن بوو، بەشەویش دەڕۆیشتە دەرەوە بۆ چیایی زەیتووون ولەوێ دەمایەوە، خەڵکی بەیانی زوو دەهاتن بۆ پەرستگا، بۆ ئەوەی گوێی بۆ ڕاگرن"[2].**

**ئین عەساکر دەگێڕێتەوە : ڕۆژێکیان حەزرەتی عیسی خەوتبوو بەردێکی خستبووە ژێر سەری خۆی، هەستی بە خۆشی خەونەکە کرد، شەیتان هات بەلایدا تێپەڕی پێی وت: ئەی عیسی تۆ ناڵێیت من هیچم ناوێت لە خۆشی و لەزەتەکانی دونیا، جاخۆ ئەم بەردە دەستکەوتێکی دونیاییە، پێغەمبەر عیسی هەستا و بەردەکەی فڕێ دا بۆ شەیتان و پێی وت ئەوە بۆ تۆ لەگەڵ دنیادا[3].**

**خەڵوەت وگۆشەگیری وخۆ لە دنیا داڕنین ودوورکەتنەوە لە خەڵکی وبەندایەتی کردن بۆ خوا لە تەسەووفی مەسیحیدا، بنەمای دووەمە بۆ ڕەهبەنبەت، کە ڕاهیبەکان خۆیان گۆشەگیر ئەکەن لە جێگا دوورە دەستەکان وبیابان و شاخەکان دا[4].**

**ڕەهبەنیەت و خۆ داڕنین لە خەڵکی لە هەستی مەسیحیەتدا هەر لەسەرتاوە هاتووە و هەتاوەکو ئێستاش بەردەوامە، وە هەستیان بەوە کردووە دابڕاون لە جیهان ڕۆحەکان تەواو وکامل دەکات، هەر لە ژیاننامەی ئیلیا ویوحناوە کاریگەری هەبووە لەسەر بیر وفکری مەسیحیەکان، ئیلیا لەلای ڕووباری**

---

**(١) وتارێك بە ناونیشانی (التصوّف المسيحي... العشق الإلهي على طريقة المسيح) نوسینی: أحمد الجدی، لەبەرواری (١٤/دیسمبر/٢٠١٧)، لە پێگەی (دار الفكر):**

http://www.fikr.com/article/التصوّف-المسيحي-العشق-الإلهي-على-طريقة-المسيح

**(٢) ئینجیلی پیرۆز ، ئینجیلی لۆقا (لو ٢١:٣٧-٣٨)، ل ١٩٣، والكتاب المقدس العهد الجديد ( إنجيل لوقا ٢١: ٣٧-٣٨)، وتفسير القاسمي-المسمى-محاسن التأويل : محمد جمال الدين بن محمد سعيد بن قاسم الحلاق القاسمي، المحقق: محمد باسل عيون السود، دار الكتب العلمية – بەیرووت، چ١، ١٤١٨ك، (ب٣/ل٣٩٣)، الكنز الجليل في تفسير الإنجيل: وليم إدي، مجمع الكنائس في الشرق الأدنى – بەیرووت، ١٩٧٣ز، (ب٢/ل٣٤٠).**

**(٣) تاريخ دمشق: أبو القاسم علي بن الحسن بن هبة الله المعروف بابن عساكر، المحقق: عمرو بن غرامة العمروي، دار الفكر- بەیرووت، ١٤١٥ك- ١٩٩٥ز، (ب٤٧/ل٤٢٠).**

**(٤) وتارێك بە ناونیشانی "التصوف في المسيحية" طريق الذاهبين إلى الله) نوسینی: مایكل عادل.**

کریت لە ڕۆژهەڵاتی ئەردەن ژیاوە و قەلە ڕەش خواردنی بۆ هێناوە،[1] بەلاّم یوحنا لە دەشتە چۆڵەکان ژیاوە، پۆلسی پەیامبەریش کاتیك ئیمانی هێنا دەرچوو بۆ بیابانی عەرەبی ڕۆژئاوای دیمەشق[2]، لەمەوە بۆیان دەرکەوتووە خەلّوەت سودێکی زۆری هەیە و پێویستە بۆ زیندووکردنەوە وبوژاندنەوەی ڕۆح، بە ئەندازەی فراوانی بیابان وکێوەکان، نەفس ودڵ وبیر وفکری مرۆڤ فراوان ئەکات[3].

«القدیس یوحنا» کە ناسراوە بە شێخ و گەورەی ڕۆحانیە مەسیحیەکان لە موناجاتێك لەگەڵ خوای گەورەدا لە خەلّوەتدا دەڵێت: "ئەی خوایە من قسەکانم لەگەڵ خەڵکی دەبچڕێنم بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ تۆ بکەم، من دەرگاکەی خۆم دادەخەم بە ڕووی خەڵکدا ئەمەوێت تۆ دەرگام لێ بکەیتەوە، من تیشکی خۆری سروشت لەخۆم حەرام ئەکەم لەبەرئەوەی تیشکی خۆری تۆم بۆ بێت، ئەی خۆری چاکەکار و چارەسەرکار لە هەر دوو باڵەکانتا"[4][5].

- هەڵبژاردنی هەژاری:

ئبن کەثیر دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك حەزرەتی عیسی جبەیەکی خوری لەبەردا بوو لەگەڵ پارچەیەك پۆشاك خۆی پێ داپۆشی بوو، بە پێ خاوسی، وقژ ئالۆسکاوی ورەنگی زەرد هەڵگەڕابوو لە تاوی برسێتی و لێوەکانی وشك ببووە لەتاو تینوویەتی هات بۆ ناو هاوەڵەکانی و پێی وتن: سلاّوی خواتان لێبێت ئەی نەوەی ئیسرائیل من دنیام دابەزاندووەتە ناو ئەو پلەیەیی خۆی کە شایەنیەتی، بە پشتیوانی خوای گەورە خۆیشم بە گەورە نازانم، ئایا ئێوە ئەزانن ماڵی من لە کوێیە؟! وتیان ئەی ڕۆحی خوا ماڵت لە کوێ یە؟؟ فەرمووی ماڵەکەم مزگەوتە، بۆنە خۆشەکەم ئاوە، خواردنەکەیشم برسێتیە، چراکەم لە شەودا مانگە، نوێژەکەم لە زستاندا هەڵهاتنی خۆرە بۆم، خواردنە خۆشەکەشم ئەوەیە لەزەوی یەتەدەرەوە، جل و پۆشاکیشم خوریيە، بانگەشەکەشم ترسانە لەخوای گەورە، جێگای دانیشتنم لای پیر و

---

(١) ئینجیلی پیرۆز، پەیمانی کۆن – یەکەم پاشایان ١٧: ٢ – ٦ ، والكتاب المقدس العهد القديم، سفر الملوك الأول ١٧: ٢ – ٦ .

(٢) ئینجیلی پیرۆز، کرداری نێردراوان ٩ : ١١، ل٢٦٩، والكتاب المقدس العهد الجديد (سفر أعمال الرسل ٩: ١١).

(٣) وتارێك بە ناونیشانی ("التصوف في المسيحية" طريق الذاهبين إلى الله) نوسینی: مايكل عادل.

(٤) مذكرات في الرهبنة المسيحية: الأنبا بؤانس، الكلية الإكليريكيية، الاهوتية، للأقباط الأرثوذكس، ل٢١-٢٢.

(٥) وتارێك بە ناونیشانی ("التصوف في المسيحية" طريق الذاهبين إلى الله) نوسینی: مايكل عادل.

هەژارەکانە، بەیانم بەسەردا دێت هیچم نیە، وە ئێوارەم بەسەردا دێت هیچم نیە، وە زۆریش ئاسودە وخۆشحاڵم خۆیشم بە دەوڵەمەنترین وسەرکەوتووترین کەس دەزانم[1].

وازهێنان لە جوانییەکان لە ڕەهبەنەتی مەسیحیەتدا مرۆڤ نابێتە هۆی شوێنکەوتنی هەواو نەفسی، ئەو ڕاهیبانەی خۆیان هەژار دەکەن وەك چۆن مامۆستاکەیان حەزرەتی مەسیح وا ژیاوە، وازهێنانە لە لەماڵ و سەروەت و سامان بە ویستێکی بەهێز وتەواوە، ئەمە پێی دەوترێت هەژارییەکی خۆویستی یاخود هەژارییەکی هەڵبژێردراو[2]، وە یەکێکە لە بانگەشەکانی مەسیح ﷺ وەك دەفەرموێت "لەسەر زەوی سامان کۆمەکەنەوە، بەڵکو سامانتان لە ئاسمان کۆبکەنەوە، چونکە سامانت لەکوێ بێت، دڵیشت لەوێ دەبێت"[3].

پەیامبەر «پۆلس» کەیەکێکە لەدنیا نەویستەکان، هەر ئەوەی نەوتووە کە خۆشەویستیت نەبێت بۆ ماڵ لەبەرئەوەی سەرچاوەی شەڕەکانە، بەڵکو داوا لە ئیمانداران ئەکات لە ماڵی دنیا ڕابکەن "ڕاستە خواترسی گەر بەقەناعەتەوە بێت قازانجێکی گەورەیە، چونکە هیچمان نەهێناوە بۆ جیهان، ئاشکرایە ناتوانین هیچیشی لێ ببەینە دەرەوەجا گەر خواردن وبەرگمان هەبوو با پێی ڕازی بین"[4].

تەسەووف لای مەسیحیەکان بەندایەتیان هەوڵدانە بۆ ئەوەی ڕۆح بگاتە پلەی کامڵ بوون و تەواوێتی، بە ئەنجامی بڕینی ئەم سێ حاڵەتەوە، وازهێنان و خۆ دوورخستنەوە لە تاوان وەك مردوو بیت بەرامبەر بەتاوان بەتەواوێتی، وە هەوڵدان بۆ ئەو شتانەی ئەبنە هۆی گەورەی و خۆ چواندن بە حەزرەتی مەسیح، وە لە کۆتایدا خۆشەویستی خوای گەورە بە دەست بهێنیت، بەمەش ئارامی بۆ مرۆڤ دێت بە یەکگرتن لەگەڵ خوادا[5].

---

(١) البداية والنهاية: أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري ثم الدمشقي، تحقيق: عبد الله بن عبد المحسن التركي، دار هجر للطباعة والنشر والتوزيع والإعلان، چ١، ١٤٢٤ك- ٢٠٠٣ز، (ب٢/ل٤٩٧-٤٩٨).

(٢) خواطر في الفقر الإختياري: الأب فاضل سيد اروس، دار المشرق – بەيرووت، چ١، ٢٠٠١ز، ل ٥.

(٣) ئینجیلی پیرۆز ، ئینجیلی مەتتا (متى ٦: ١٩-٢١)، ل ١٢-١٣، والكتاب المقدس العهد الجديد ( إنجيل متى ٦: ١٩-٢١).

(٤) ئینجیلی پیرۆز ، نامەی یەکەمی پۆلس بۆ تیمۆساوس (١ تى ٦: ٧) ( ل ٤٦٢)، والكتاب المقدس العهد الجديد، رسالة بولس الرسول الأولى إلى تيموثاوس (١ تي ٦: ٧).

(٥) وتارێك بە ناونیشانی ("التصوف في المسيحية" طريق الذاهبين إلى الله) نوسینی: مایكل عادل.

## لقی سێ هەم: سۆفیگەری لای هیندەکان

ولاَتی هیند هەر لە کۆنەوە بە ولاَتێکی حیکمەت و فەلسەفە دادەنرێت، شارەزاییان لە زانستەکانی ئەستێرە ناسی وبیرکاری ولۆجیك وپزیشکی وجادوودا هەبووە، فارسەکان دەوریان لە بلاَوبوونەوەی ئەم زانستانە هەبووە لە نیوە دوورگەی عەرەبیدا هەبووە[(١)].

«سەلجوقیەکان» لەسەردەمی خەلیفەی عەباسی دا لە ١٤ی ذي القعدةی ٤١٦ك بەسەرکردایەتی سولَتان «محمودی سەبوکتەکین» لە جەنگی «سومنات» بە هێزێکەیەوە ڕۆشتە ناو شاری «سومنات» کە پەرستگایەکی هیندۆسیەکانی تێدایە کە بتێکی تێدابوو، ئەم جەنگە بەسەرکەوتنی مسولَمانەکان کۆتایی هات، سولَتان بڕیاری شکاندنی ئەو بتەی دا کە ناوی «سومنات» بوو، بەمەش «سولَتان محمود» هەرێمی «کشمیر»ی فەتح کرد[(٢)].

لە هیندستان چەند ئاینێك هەن لەوانەش:

- **ئاینی هیندۆسی:**

ئەم ئاینە یەکێکە لە دینە گەورەکانی هیندستان باوەڕیان بە «التناسخ الأرواح» هەیە، باوەڕیان بە هەبوونی خوای گەورە وڕۆح ومادە هەیە کە هەر لەسەرەتاوە هەبوون، دەلَێن ڕۆح بەتەواوەتی تیا ناچێت، بەلَکو کاتێك ڕۆح لە جەستە دەردەچێت دەچێتە ناو جەستەیەکی تر، دوای مردنی ئەویش ئەچێتە ناو جەستەیەکی تر، ئەم گواستنەوەی ڕۆحە بەردەوام ئەبێت هەتا ئاخر زەمەن[(٣)].

یەکتاپەرستی بەووردی نایەتە جێ، بەلاَم کاتێك خوایەك قەبولَ ئەکەن لە خواوەندەکانی خۆیان ئەوا پێویستە قەبولَی بکەن بەسەرجەم بالَەکانی تاوەکو چاوەکانی دادەخات و سەرجەم خواوەندەکان ئەهێننە پێش چاوی خۆیان، لەم ڕێگەوە گفتوگۆ لەگەلَ خواوەندەکانی خۆیاندا ئەکەن.

---

(١) تاريخ الفلسفة في الإسلام: دي بور المترجم، المحقق: محمد عبد الهادي أبو ريدة، دار النهضة العربية – بەیرووت، چ٣، ١٩٥٤ز، ل ٢٦-٢٧.

(٢) سير أعلام النبلاء: شمس الدين أبو عبد الله محمد بن أحمد بن عثمان بن قَايْماز الذهبي، المحقق : مجموعة من المحققين بإشراف الشيخ شعيب الأرناؤوط، مؤسسة الرسالة- بەیرووت، چ٣، ١٤٠٥ك- ١٩٨٥ز، (ب١٧/ل٤٩١)، ودولة السلاجقة وبروز مشروع إسلامي لمقاومة التغلغل الباطني والغزو الصليبي: علي محمد محمد الصلابي، مؤسسة اقرأ- قاهیرە، چ١، ١٤٢٧ك-٢٠٠٦ز، ل ٢٦.

(٣) دراسات في الديانات الهندية: محمد ضياء الرحمن الأعظمي، مجلة الجامعة الإسلامية – مەدینەی منەوەرە، (ب٩/ل١٣٨).

ئەوان باوەڕیان بەژمارێەکی زۆر خوا هەیە، دەڵێن هەموو سروشتێك بە سوودگەیاندن وزیان گەیاندن هەردانە وخوایەکی هەیە، بەندایەتی بۆ دەکەن وەك خوای ئاو و خوای هەوا و خوای ڕۆژ و خوای شاخ وکێوەکان.....هتد، ئەمانە ئەپەرستن بۆئەوەی لێی نزیك ببنەوە.لە سەدەی نۆیەمی پێش زاین کاهینەکان کۆبوونەوە وتیان لەدەرەوەی جیهان یەك خوا هەیە بە زات وئەم سێ ناوەیان لێناوە، ئەوانیش:{«براهما» لە ڕووی بوونەوە«موجود»،«فشنو» لەڕووی پارێزەرەوە «الحافظ»، «شیڤا» لە ڕووی «ئارامگرتنەوە» «مهلك»} ، بەندایەتی بۆ دانەیەکیان بکرێت وەك ئەوە وایە بۆ ئەوانی تری بکەیت[(١)].

باوەڕیان وایە کە «براهما» یەکەم مرۆڤی خولقاندووە وخۆی گیانی جیهانە وهەموو خواوەندەکان ژیان لە براهماوە وەردەگرن، ئەم بیرۆکەیە زۆر فراوان بوو تاوای لێهات بەرەو یەکێتی بوون وتێچوون هەنگاوی نا، هەروەها دەیانگوت گیانی مرۆڤ هەمان گیانی «براهما»یە[(٢)].

کتێبەکەیان بریتیە لە «ڤیدا»: واتە زانیاری، هەر لە کۆنەوە دەستەواژەی «ڤیدا» بۆ سەرجەم کتێبی ئاینی هیندۆسی بەکارهاتووە، پاشان «ڤیدا» لە چوار کتێب پێکهاتووە، ئەوانیش: {ڕیگ ڤیدا، یاجور ڤیدا، سام ڤیدا، ئاتوور ڤیدا} ، هەتاوەکو ئێستاش بە باوەڕپێکراوترین وگرنگترین کتێبە پیرۆزەکان دێنە هەژماری لەلای هیندۆسیەکان. ئەم کتیبّبە دابەش نەکراون بەسەر فەصڵ وبابدا ، بەڵکو تەنها بریتین لە چەند بەشێکی بلاّوکراوە بۆ پێدانی زانیاری دەربارەی بەندایەتی ودنیا نەویستی لە سەدە تاریکەکانی پێش زاینی. «ڤیدا» دابەش دەبێت بەسەر دووجۆردا ئەوانیش: {یەکەمیان «سەنهیتا» واتە: مەتن یاخود دەق، دووەمیان «برەهماناس» واتە: ڕاڤەو شیکردنەوە}[(٣)].

---

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة: الندوة العالمية للشباب الإسلامي، إشراف وتخطيط ومراجعة: مانع بن حماد الجهني، دار الندوة العالمية للطباعة والنشر والتوزيع، چ٤، ١٤٢٠ك، (ب٢/ل٧٢٦).

(٢) الاديان دراسة تاريخية مقارنة: رشدي عليان وسعدون الساموك، دار الحرية- بەغداد، ١٩٧٦ز، ل ٨٨.

(٣) أثر الملل والنحل القديمة في بعض الفرق المنتسبة إلى الإسلام: الدكتور عبد القادر بن محمد عطا صوفي، الجامعة الإسلامية- مەدینەی منەوەرە، چ٣٦، ژمارە (١٢٥)ی ساڵی ١٤٢٤ك-٢٠٠٤ز، ل٥٠، والأساس في السنة وفقهها - العقائد الإسلامية: سعيد حوّى، دار السلام - قاهیرە، چ٢، ١٤١٢ك- ١٩٩٢ز، (ب٢/ل٧٩٤).

«ڤیدانت» مانای ناوەڕۆکی «ڤیدا» ئەگەیەنێت، لەناو کتێبە فەلسەفی وئەخلاقیەکانی هیندۆسی زۆرجار ئەم دەستەواژەیە بەکاردێت، کە لەقەبارەدا بچوکە بەڵام کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر بیر وفکری فەیلەسوف و سۆفییە هیندیەکان[1].

باوەڕیان بە «کارما» هەیە واتە یاسای پاداشت و سزا لەسەر دادپەروەری، ئەو دادپەروەریە مەرج نیە لە ژیانی ئێستادا بێتە دی، بەڵکو پاداشت و سزا لە دنیایی ئاخیردا دەدرێتەوە، چونکە دونیا خانەی تاقیکردنەوەیە و خانەی پاداشت و سزا نیە[2]، دوا ئامانجی هیندۆسیەکان ئەوەیە ڕۆحی لە لەشی ڕزگار ببێ و لەگەڵ «براهما» ببێت بەیەك و تێکەڵ بن[3].کەواتە بیرۆکەی یەکێتی بوون و تێچوون لەدێر زەمانەوە هەبووە وخەڵکی بڕوایان پێیان هێناوە.

باوەڕیان بەوە هەیە کە ڕۆحی خواکانیان چووەتە لەشی کەسێکەوە بەناوی «کریشنا»، بەمەش خوا خۆی ئەخاتە ناو لەشی مرۆڤەوە، بەجۆرێك قسە لەباری «کریشنا» ئەکەن وەك چۆن مەسیحیەکان لەبارەی مەسیحەوە قسە ئەکەن، وەك ئاوێتە بوونی لاهووت و ناسوت[4].«کریشنا» بەواتای ڕەش یاخود تاریك دێت.

- **ئاینی جینی:**

لەسەردەستی «مهاویرا»ی کوڕی ئەمیری ولاتی هیند لەساڵی ٥٩٩ پ.ز وازی لە خۆشی و چێژەکانی دنیا هێناوە ولەسەردەستی «براهمە» لەئایین وڕاهیبەکانی کۆڵییەوە ودوازدە ساڵی تەواو لەقسەکردن بەڕۆژوو بوو تا لە هەموو نهێنییەکانی گەردوون گەیشت وپەردەی حەقیقەتی بۆ لادرا، شێوازی ڕۆژووگرتنەکەی دوو ڕۆژ ونیو نانی نەخواردووە، پاشان هەموو موەکانی جەستەی هەڵکێشاوە، بەپێی پەتی بەناو شاردا گەڕاوە، سیازدە مانگ بەبێ جل وبەرگ بووە، خۆی برسی کردووە بۆ ئەوەی نەفسی بە برسێتی بکوژێت، زۆر بیری کردووەتەوە، ئەگەر زۆر ڕۆدەچوو لە چاودێری کردنی خۆیدا

(١) فصول في أديان الهند: (الهندوسيَّة، والبوذيَّة، والجينيَّة، والسيخيَّة)، وعلاقة التصوّف بها: محمد ضياء الرحمن الأعظمي، دار البخاري- مەدینەی منەوەرە، چ١، ١٤١٧ك – ١٩٩٧ز، ل ٤٥.

(٢) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة: الندوة العالمية للشباب الإسلامي (ب٢/ل٧٢٨).

(٣) الاديان دراسة تاريخية مقارنة: رشدي عليان وسعدون الساموك، ل٨٩.

(٤) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة: الندوة العالمية للشباب الإسلامي (ب٢/ل٧٢٦).

هەستی نەئەکرد کە دڵخۆشە یان بێزار، وە هەستی بەئازار وئیسراحەت نەئەکرد،«مهاویرا» بڕوای بەوە نییە کەوا خواوەندێکی گەورە جیهانی خوڵقاندووە[1].

باوەڕیان وایە کە «شەرمکردن» ئەچێتە چوارچێوەی تاوانەوە، واتە هەستکردن بەنەمانی شەرم مانای وایە تاوان لەلای ئەو کەسە نەماوە ئەمەش ئەبێتە هۆی زیادبوونی پوختی ئەو کەسە، لەسەر هەموو بەندایەتیەك پێویستە دووربیت لە هەموو تاوانێك و بە بێ جل وبەرگ وبەڕووتی بەندایەتی بکەیت، هەوا و ئاسمان بکەیت بە پۆشاك لەکاتی بەندایەتیدا، بەجۆرێك جەستە فانیەکەیان فەرامۆش ئەکەن کە وەك خۆکوشتنێك دێتە هەژمار کە ئامادەن بە خۆبرسیکردن خۆیان بەرەو مردن ببەن[2].

بیرو باوەڕیان بە «کارما» و تەناسوخی ڕۆحەکان «دووناو دوون» هەیە، خۆیان لەسەر ئارمگرتن و خۆ برسیکردن ڕادەهێنا بۆ ئەوەی لە یاسایی «کارما» ڕزگاریان ببێ بەهۆی بگری و دوور کەوتنەوە لە چێژەکان، بەم شێوەیە بە نەمری دەمێنێتەوە وپێی دەڵێن «ڕزگاربوون» کە لەگەڵ نێرڤانای هیندۆسی و بووذی هاوشانە[3].

(١) أديان الهند الكبرى (الهندوسية،الجينية،البوذية): أحمد شلبي، مكتبة النهضة المصرية - قاهيرە، چ١١،٢٠٠٠ز، ل١٠٨.

(٢) الأساس في السنة وفقهها - العقائد الإسلامية: سعيد حوّى، (ب٢/ل٦٤٥).

(٣) الفلسفة الصوفية في الإسلام: عبدالقادر محمود، دار الفكر العربية- قاهيرە، چ١، ١٩٦٦ز، ل١٠.

▪ **ئاینی بووذی:**

لەسەر دەستی شازادە «سدهارتا» لە ٤٦٠ – ٤٧٠ پ.ز پەیدابوو وازی لە خۆشی ژیان هێنا بەرەو کێو وئەشکەوتەکان ڕۆشتووە و هەر خەریکی وەرزشی ڕۆحی بووە و دوورکەوتنەوە لە ژیانی ماددی بوو، پەیامەکەی بریتی بوو لە پاککردنەوەی نەفس و نەهێشتنی ئازار بەگشتی.

«بووذا» بڕوای بە تەناسووخی ڕۆحەکان «دووناو دوون» هەیە و بەلاّم باوەڕی بە «نیرڤانا»[(١)] نەبوو، چونکە ڕزگاربوون بەتوانەوەی لە خوادا نابێ بەڵکو بە گەیشتنە لووتکەی بێگەردی وپاککردنەوەی نەفس و قەلاچۆکردنی ئارەزووە ماددییەکان دەبێت، دەتوانین فەلسەفەی بووذا لە دوو وشە کۆکەینەوە «ئاشتی وخۆشەویستی»[(٢)].

هەرچەندە لە کۆنەوە ژیانی ڕۆحی و وەرزشی نەفس وئازاردانی لەش لەولاّتی هیندا باو بوو، بەلاّم لەگەڵ تەسەووفی ئیسلامی جیاوازی زۆرە لەلایەن بیرۆکەی خودی خوایی و هۆکارەکانی وئەنجامی تەسووفییەکە تەنیا شتێ کە بەیەکیان دەبەستێتەوە و ئازاردانی لەشەو بەس[(٣)].

لەلایەکی ترەوە بووذاییەکان مەبەستیان پەروەردەکردنی ئاکاری نەفس وپاککردنەوەی دەروونە، کەچی سۆفییە مسوڵمانەکان پەروەردەکردنی نەفس لەگەیشتن بە ناسینی خوا وعیشقی خواوە دەزانن، جیاوازیی نێوان توانەوە«فنا»ی سۆفییەکان و«نیرڤانا»ی بووذیەکان لەوەدایە، «نیرڤانا» هەوڵی توانەوەی تەواوەتی دەدا، بەلاّم توانەوەی سۆفییەکان بۆ ژیانی هەمیشەییە لەخوادا[(٤)].

---

(١) نیرڤانا: وەکو فەنای سۆفییەکانە وبریتییە لە لەناوچوونێك وتوانەوەیەکی ڕەهای بێ کۆتایی لەناو نەفسی گشتیدا و دەگاتە خۆشییەك وبەختیارییەکی وا کە هەست بە بوونی خۆی ناکات.{قصة الحضارة: وِل ديورَانت = ويليام جيمس ديورَانت، تقديم: الدكتور محيي الدّين صَابر، ترجمة: الدكتور زكي نجيب محمُود وآخرين، دار الجيل- بەيرووت، ١٤٠٨ك- ١٩٨٨ز، (ب٣/ل٨٤)}.

(٢) الاديان دراسة تاريخية مقارنة: رشدي عليان وسعدون الساموك، ل٩٦-١٠١.

(٣) تاريخ الفلسفة في الإسلام: دي بور، ل١٧.

(٤) تأريخ تصوف در إسلام: قاسم غنى، چاپ پنجم، چاپ گلشن – تهران، ١٣٦٩هـ.ش، ل١٦٦-١٦٨.

## لقی چوارەم: سۆفیگەری لای مسوڵمانەکان

قورئانی پیرۆز لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرچاوەی هەموو زانستەکانە هەر لە پەرستش ومامەڵە وبیروباوەڕدا، پێغەمبەرﷺ هاوەڵانی فێرکردووە وئەوانیش گوێیان گرتووە وجێ بەجێیان کردووە، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ زانستێك نەبووە بەناوەکانی «الفقه وأصول الدين والحديث والتصوف»، هەرچەندەش هاوەڵان جێ بەجێیان کردووە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، وە کەسێك نەناسراوە لەناو هاوەڵاندا بە «فقيه، أصولي، محدّث، صوفي»، لەکاتێکدا ئەوان لە بەڕێزترینی مسوڵمانان بەڵام هیچ نازناوێکیان بۆ خۆیان دانەناوە جگە لە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ،کە هیچ ناوێك لەسەرووی ئەوەوە نیە وهاوشێوەی ئەوە نیە کە بەهاوەڵی پێغەمبەری خوا ناوبرێن، ئەمەش بەهۆی گەورەی وڕێزی پێغەمبەری خوایە ﷺ[1].

ئومەتی ئیسلام لە پێغەمبەری خواوە ﷺ سەرچاوەی گرتووە، ئینجا هاوەڵان وشوێن کەوتووان پایەدار بوون بەژیانێکی ڕووناك وسەرفراز، کەسەرچاوەکەی پابەندبوونە لەسەر پەرستش ودابڕان بۆ خوای گەورە و پشت هەڵکردن لە جوانیەکانی دونیا، خۆ بەدوور گرتن لەوەی کە مرۆڤەکان هەوڵی بۆ ئەدەن لەتام وچێژی دونیا وسەروەت وسامان وپلەو پایە، خۆ دوورخستنەوە لە خەڵکی و یەکلابوونەوە بۆ پەرستش[2]، هاوەڵان وشوێن کەوتووان پێشەوای دنیا نەویستان وبەندەکان وپشت بەستراوان بەخوا وهەژاران وئارامگران بوون[3].

هاوەڵان پێویستیان بە فێرکردنی زانست نەبووە تاوەکو ڕێنمای بکرێن وهەستن بە ئەنجامدانی ئەو کارە، بۆ نموونە لە زماندا عەربییەکی پەتی بوون و پشتا وپشت لەگەورەوە بۆ بچوك عەرەبییان زانیووە، پێویستیان بەوە نەبووە تاوەکوو فێری وانەی «النحو و البلاغة»بن، هاوەڵان و شوێنکەوتووان ئەگەر چی بانگ نەکرابن بە «سۆفی»، بەڵام لەهەمان کاتدا سۆفی بوون، ئایا مەبەست لە تەسەووف لەوە زیاتر چی یە کە مرۆڤ بۆ خوای گەورە بژی نەك بۆ نەفسی خۆی؟! وە خۆی بڕازێنێتەوە بە دنیا نەویستی

---

(١) عوارف المعارف: للإمام شهاب الدين أبي حفص عمر السهروردي، ضبطه محمد عبد العزيز الخالدي، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١، ١٩٩٩ز، ل٤٣.

(٢) مقدمة ابن خلدون: عبد الرحمن بن محمد بن خلدون الحضرمي، دار القلم- بەيرووت، ١٩٨٤ز، ل٤٦٧.

(٣) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٢٢.

وپابەندبوون بە پەرستشەکانی و بەگیان وبە دڵ لە هەموو کات وسات وبارێکدا ڕووبکەنە دەرگانەی خوای گەورە، هاوەڵان وشوێن کەوتووان تەنها بەدان پێدانانیان بە بیروباوەڕ وهەستان بەهەموو فەرمان پێکراوەکانی ئیسلام نەوەستاون، بەڵکو هەوڵیان داوە چێژ ببینن لەو بەندایەتییەی کە بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورە دەیکەن، سەرەڕای پەرستشە فەرمان پێکراوەکان هەستاون بە ئەنجامدانی ئەو پەرستشانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی ویستوون و ئەنجامی داوون. پاشان دوورکەوتوونەتەوە لە هەموو بێزراوەکان «المكروهات» وپێشیان خستووە بەسەر کارە یاساغەکان «المحرمات»دا، هەتاوەکو بیناییان ڕۆشن بوویەوە و، بەمەش کانی دانایی وحیکمەتیان لە دڵەکانیاندا تەقییەوە، دەرئەنجام ئەو سێ سەردەمەی هاوەڵان وشوێن کەوتووان وشوێنکەوتەی شوێن کەوتووان بە شێوەیەکی گشتی بوون بە باشترین وڕازاوەترین وبەختەوەرترین سەردەمەکانی ئیسلام[1]، وەك چۆن پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هەواڵمان پێ ئەدات لەبارەی ئەو سەردەمەوە و دەفەرموێت: "خير أمتي قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم"[2]، واتە: باشترین سەدە سەدەی منە، دوایی ئەوانەی بەدوایاندا دێن، دوایی ئەوانەی بەدوایاندا دێن.

لە کاتێکدا ئەو سەردەمانەی هاتنە پێش چەند گەلێکی جیاواز هاتنە ناو ئیسلامەوە، وە بازنەی زانستەکان فراوان بوون، وهەر گرۆ وکۆمەڵێك هەستان بەنووسینەوەی ئەو زانستەی کە زۆرترین زانیاریان لەبارەوە هەبووە، وەیەکەم شتێ کە لێکۆڵەرەوان گرنگی وبایەخیان پێداوە زانستی شەریعەت بووە کە لە یاسا کردارییە ئاشکراکان «الأحكام العملية الظاهرية» دەکۆڵنەوە، وە فەقیهەکان چەند کتێب ونامەیان«رسائل» لەفقهدا داناوە، بۆ هەڵهێنجاندنی یاساکان «لإستنباط الأحكام» وپۆلێنکردنی بابەتەکان لە لقەکانەوە بۆ بنەماکان «الفروع إلى الأصول»، بەمەش زانستی بنەماکانی

---

(١) گۆڤاری (العشيرة المحمدية) ژمارەی مانگی (محرم)ی ساڵی ١٣٧٦ك، وبحث عن التصوف من الوجهة التاريخية د. أحمد علوش، حقائق عن التصوف: عبدالقادر عيسى، ل٢٢-٢٣.

(٢) صحيح البخاري: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، تحقيق وتعليق: مصطفى ديب البغا، دار ابن كثير – بەيرووت، چ٣، ١٤٠٧ك – ١٩٨٧ز، كتاب فضائل الصحابة / باب فضائل أصحاب النبـي ﷺ ورضي الله عنهم، ومن صحب النبي ﷺ أو راه من المسلمين فهو من أصحابه/ ژمارەی فەرموودە ٣٤٥٠، (ب٣/ل١٣٣٥).

فیقه «علم أصول الفقه» وەرگیرا لەزانستەکانی فیقهـ ویاساکانی، پاشان چەند زانستێکی تر نوسرانەوە وەك زانستەکانی «یەکتاپەرستی وفەرمووده نناسی وتەفسیر ومەنتیق وهاوشێوەیان....»[1].

وە هەروەها دوای ئەو ماوەیە کاریگەرییە ڕۆحیەکان بەرەو کەم بوون ڕۆشتن، خەڵکی کەوتبوونە بارێکەوە گرنگی ڕووکردنە خوایان بە پەرستش ودڵ لەلا کەم ببوویەوە، ئەوانەی ڕوو لەخوا بوون جیا ئەکرانەوە لەوانی تر بەوەی ئاگادار بوون لەمەبەست وناوەڕۆکی پەرستشەکان وسەرنجدان لەسەر چاودێری کردنی ڕەوشت وهەڵسەوکەوت ولێ پرسینەوەی نەفسی، وە ناوی سۆفیان بەسەردا برا وبەو ناوەوە ناسران[2]، هەر لەو ڕوانگەوە ئیشیان بۆ نوسینەوەی «زانستی تەسەووف» کردووە، سەلماندنی گەورەی ورێزی ئەم زانستە بەسەر زانستەکانی ترەوە، ئەمەش بووە هۆکاری سەلماندنی هۆکارەکانی چاکە ولەخوا ترسان، وتەواوکردنی پێویستیەکانی ئایین لەسەرجەم لایەنە چالاکەکاندا[3]،وە زانستی تەسەووف بوو بەزانستێکی نوسراو لەنێو مسوڵمانان پاش ئەوەی تەنها ڕێباز«الطریقة[4]»ێکی پەرستش بێت، وە هەروەها زانستی تەسەووف وەرگیران لە سنگی پیاوانەوە هەروەك زانستەکانی تر چۆن لە سەرەتادا وەرگیران و کران بەکتێب وەك زانستەکانی «تەفسیر وفەرمووده وفیقه وبنەماکانی فقه وهاوشێوەیان....»[5].

باری سیاسی ئەو ڕۆژانە وئاشوب وفیتنەی نێو مسوڵمانان لەدوای شەهید کردنی هەردوو جێنشین عوسمانی کوڕی عەففان وعەلی کوڕی ئەبی تالیب خوا لێیان ڕازی بێت، کاریگەریکەی زۆری هەبوو لەپەرتەوازەبوونی هاوەڵە دنیا نەویستەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ حیجاز وبەصرە وعێراق، هەریەکێك لەو

---

(١) دراسات عقلية وروحية في الفلسفة الإسلامية: علي عبد الفتاح المغربي، مكتبة وهبة- قاهيره، چ١، ١٤١٥ك-١٩٩٥ز، ل١٩٩، وعوارف المعارف: للإمام شهاب الدين أبي حفص عمر السهروردي، ل١٢، ومقدمة ابن خلدون: عبد الرحمن بن محمد بن خلدون الحضرمي، ل ٤٩٦، وحقائق عن التصوف: عبدالقادر عيسى، ل٢٣.

(٢) بين السلفية والصوفية الاعتقاد الصحيح والسلوك السليم: زاهد يحيى الزرقي، مطبعة الحوادث- بەغداد، چ١، ١٩٩٠ز، ل١٦.

(٣) گۆڤاری (العشيرة المحمدية) ژمارەی مانگی (محرم)ی ساڵی ١٣٧٦ك.

(٤) الطريقة: بريتيە لە شوێن کەوتنی ئاکارەکانی پێغەمبەر ﷺ وکار پێکردنی {السير والسلوك إلى ملك الملوك: لشيخ قاسم بن صلاح الدين الخاني، تحقيق: سعيد عبد الفتاح، مكتبة الثقافة الدينية- قاهيره، چ١، ٢٠٠٢ز، ل ٤٣}.

(٥) مقدمة ابن خلدون: عبد الرحمن بن محمد بن خلدون الحضرمي، ل٤٩٦.

هاوەڵانە گۆشەیەکیان تایبەت کردبوو بەخۆیانەوە بۆ کۆبوونەوەی ئەهلی صوفە[1]،لە جێبەجێ کردنی ئەم فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: "إنها ستكون فتن ألاَ ثم تكون فتنة القاعد فيها خير من الماشي فيها والماشي فيها خير من الساعي إليها إلا فإذا نزلت أو وقعت فمن كان له إبل فليلحق بإبله ومن كانت له غنم فليلحق بغنمه ومن كانت له أرض فليلحق بأرضه"[2]، واتە: «بێگومان لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت بزانن ئاگاداربن دیسان پێتان دەڵێم لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت، دیسان ئاگادار بن لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت، ئەوەی دانیشتووە تێیدا باشترە لەوەی بەناویدا دەڕوات، ئەوەیشی تێیدا دەڕوات باشترە لەوەی بە تەکان بەرەو پیریەوە دەچێت، ئاگاداربن کاتێکیش دابەزییە ناوتان-یا ڕوویدا- با هەرکەسێك حوشتری هەبوو بچێتە بەلای حوشترەکەی خۆیەوە و، هەرکەسیش مەڕی هەبوو بابچێت بەلای مەڕی خۆیەوە، هەرکەسیش زەوی و زاری هەبوو بابچێت بەلای زەوی و زاری خۆیەوە»، چەند بازنە وحەڵقەیەك هەبوون وخۆیان تەرخانکردبوو بۆ قورئان خوێندنەوە ووردبوونەوە لە ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ ولە فەرموودە پیرۆزەکانی کەهاتوون دەربارەی خۆ بەدوورگرتن لە ئاژاوە ودوورکەوتنەوە لە ئاژاوەگێڕەکان، وە دەست گرتن بەقورئان وفەرموودەکانەوە، بیر وفکریان ڕێك کردووە بۆ وەرگرتنی زانستەکان، دڵیان ڕووناك بوویەوە بەنووری خوای گەورە، وەهەموو بەربەستەکانیان لەبەرچاو لاچوو[3]،ئەو کەسانە ناسرابوون بەناوی دنیا نەویست وخواپەرستەکان، لەبەر هەبوونی جیاوازی لە کەسەکانی چواردەوریدا لە پەرستشێکی زۆر وناسراویان بە لانەدانیان لە ڕێگەی ئیسلام، زوهد ودنیا نەویستی سەرەتای دەرکەوتنی تەسەووف بووە، لە دوو سەدە پێش هیجرەت ئەم ناوە تایبەت بوو بەوانەی کە خۆیان یەکلاکردبوویەوە بۆ خوای گەورە دڵیان لەهەموو ڕێگەیەکی بێ ئاگای

---

(١) عوارف المعارف: إمام شهاب الدين أبي حفص عمر السهروردي، ل٤٤، وفلسفة الحياة الروحية منابعها ومشاربها ونشأتها ونشأة التصوف والطرق الصوفية: مقداد يالجن، دار الشروق- بەيرووت، چ١، ١٩٨٥ز، ل ٧٩-٨٠، والتصوف وفريد الدين العطار: عبد الوهاب عزام، مؤسسة هنداوي للتعليم والثقافة-ميسر، ٢٠١٢ز، ل١٩-٢٠.

(٢) صحيح مسلم: مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري، المحقق: محمد فؤاد عبد الباقي، دار إحياء التراث العربي – بەيرووت، كتاب الفتن وأشراط الساعة / باب نزول الفتن كمواقع القطر/ ژمارەی فەرموودە ٢٨٨٧، (ب٤/ل٢٢١٢).

(٣) شعب الإيمان: أبي بكر أحمد بن الحسين البيهقي، تحقيق: محمد السعيد، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١، ١٤١٠ك، (ب٣/ل٣٦٣)، ومعالم الطريق إلى الله بين الشريعة والطريقة والحقيقة على أضواء من نور الإسلام والإيمان والإحسان: محمود أبي الفيض المنوفي، دار نهضة- قاهيرە، ١٩٦٩ز، ل٩٥.

وغەفڵەت ئەپاراست، لەدوای ئەوە داهێنراوەکان وای کرد کە بین بەچەند گرۆ کۆمەڵێکەوە کە هەریەکەیان بانگەشەی دنیا نەویستی وخوا پەرەستی بۆ خۆی دەکرد[١].

لەشاری بەصرە سەرچاوەی سەرهەڵدانی بیری تەسەووف بووە، یەکەم کەسێك کە ڕێگەی ئەم زانستەی بڕی وە ماناو مەبەستەکانی ڕوونکردەوە حەسەنی بەصری بوو، کە ماڵەکەی مەجلیسێك بوو لەمەجلیسەکانی زانست لەگەڵ شوێن کەوتووان وبراکانی دا تاوتوویێی بەندایەتی و پەرستشەکانیان دەکرد، لەڕازەکانی دڵ وخراپەکاری و وەسوەسەی ناخ فەرمایشتەکانی چڕ کردبوویەوە[٢]،بە فەرمایشتانێك کە هیچ یەکێك لە هاوەلانی پێشتر نەیان بیستبوو، پێی وترا ئەی باوکی سەعید تۆ فەرمایشتانێك ئەفەرموویت لەم زانستەدا کە لەکەسی تر نەمان بیستووە، ئایا لەکێت وەرگرتووە ئەم فەرمایشتانە؟!، فەرمووی لە حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ وەرگرتووە، حوزەیفە هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ بوو، تایبەت مەند بوو بە زانستی وردەکاری ناخ وەکو دووڕووی وچۆنێتی تووشبوون بە دووڕووی وهۆکارەکان وچارەسەری، پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەتی کردبوو بەزانینی یەقین، ناونرابوو بە خاوەنی نهێنی، لەبەرئەو زانستەی کە هەیبوو بەمەقام وپلەکان دڵ وحاڵەکانی[٣]، ڕیوایەت کراوە لە عەلقەمەوە خوا لێی ڕازی بێت، کاتێك کە چووە بۆ شام کاتێك کە چوویە ناو مزگەوتەوە فەرمووی "خوایە گیان بۆم ئاسان بکە پیاو چاکێك ببینم ولەگەڵی دانیشم، لەگەڵ ئەبو دەرداء خوا لێی ڕازی بێت دانیشت، ئەبو دەرداء فەرمووی لەکوێوە هاتوویت؟!، وتی: من لە خەڵکی کوفەم، پێی فەرموو: ئایا کەسێکتان تێدانیە خاوەنی نهێنیەك بێت کە کەسی تر نەیزانێت؟ «مەبەستی حوزەیفە بوو»، فەرمووی: بەڵێ تێماندایە"[٤].

---

(١) الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب٢/ل١٢).

(٢) قوت القلوب في معاملة المحبوب ووصف طريق المريد إلى مقام التوحيد: محمد بن علي بن عطية الحارثي، أبو طالب المكي، المحقق: عاصم إبراهيم الكيالي، دار الكتب العلمية – بەيرووت، چ٢، ١٤٢٦ك -٢٠٠٥ز، (ب١/ل٢٥٧).

(٣) معالم الطريق إلى الله بين الشريعة والطريقة والحقيقة ....: محمود أبي الفيض المنوفي، ل٢٧٣.

(٤) صحيح البخاري: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، كتاب فضائل الصحابة/ باب مناقب عمار وحذيفة رضي الله عنهما/ ژمارەی فەرموودە ٣٥٣٢، (ب٣/ل ١٣٦٨).

ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زانستی تەسەووف لەسەردەمی هاوەڵاًن وشوێن کەوتوواندا نەبووە بەم ناوەوە، بەڵکو هەموو زانستەکە وباسەکانی وزانیارییەکانیان زانیووە هەروەك وچۆن زانا بوون بە بنچینەکانی زانستە شەرعیەکانی تر کە لە سەردەمی ئەواندا نەبووە، پرسیار کرا لە پێشەوا محەمەدی کوڕی صدیقی غەمراوی سەبارەت بەوەی کە یەکەم کەس تەسەووفی دامەزراند وئایا نیگاو وەحییەکی ئاسمانی بووە؟، فەرمووی: ئەوەی یەکەم جار ئەم ڕێگەیەی دانا دەبێ بزانرێت ئەم ڕێگەیە لە نیگا ووەحی ئاسمانیەوە گەلاڵەی کردووە، ئەم ڕێگەیە بێ گومان خۆی دەبینێتەوە لە مەقامی ئیحساندا کەیەکێکە لە سێ بنەماکانی دین کە پێغەمبەری خوا ﷺ یەك لەدوای یەك وپلە بەپلە ڕووی کردووەتەوە وباسی کردووە، وەك لە فەرموودەی "فإنە جبریل أتاكم یعلمکم دینکم"[1] دایە، سێ بنەماکەی دین پێکهاتوون لە «ئیسلام وئیمان وئیحسان» کەئیسلام گوێڕایەڵی و بەندایەتیە، ئیمان نوور وڕووناکی وبیروباوەڕە، ئیحسان مەقامی «مراقبە ومشاهدە»یە: "أن تعبد الله کأنك تراه، فإن لم تكن تراه فإنه یراك" واتە: وا خوا بپەرستی بکە وەك وئەوەی کە بیبینیت، ئەگەر چی تۆ ئەو نابینیت خۆ ئەو تۆ ئەبینێت[2]، دوای ئەوەی کە ئەمانەمان باسکرد و ڕوونمان کردەوە هیچ سەر سوڕمانێکی تێدانیە و ئەتوانین بڵێین پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم سۆفی بووە لە ئیسلامدا، بەڵگەمان ژیانی پەرستشەکانی ودنیا نەویستیەکەی وگۆشەگیریکەی لەکاتی بەندایەتیدا[3].

لەدوای سەدەی یەکەمی هیجری تەسەووف وردە وردە وپلە بەپلە لەناو خەڵکدا پەرەی سەند، خەڵکی وفێرخوازان لەخزمەت پێشەواکانی دین هەوڵی فێربوونی زانستی تەسەووفیان دەدا، دەستەواژەی سۆفی لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیدا بەکار هاتووە، بەرامبەر ئەو کەسانەی کە

---

(١) صحیح مسلم: مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشیري النیسابوري (ژمارەی فەرموودە ٨) کتاب الإیمان/ باب بیان الأیمان والاسلام والإحسان، (ب١/ل٣٧)، ورواه البخاري في صحیحه بلفظ: (جاء جبریل علیه السلام یعلمکم دینکم)، کتاب الإیمان/ باب سؤال جبریل النبي ﷺ عن الأیمان والاسلام والاحسان وعلم الساعة وبیان النبي ﷺ له، (ب١/ل٢٧).

(٢) الانتصار لطریق الصوفیة: أحمد صدیق الغماري، مطبعة دار التألیف- میسر، ل٦، وعواطف اللطائف من أحادیث عوارف المعارف: أحمد بن محمد بن الصدیق الغماري، المکتبة المکیة- سعودیه، چ١، ٢٠٠١ز، (ب١/ل٨٣).

(٣) معالم الطریق إلى الله بین الشریعة والطریقة والحقیقة ....: محمود أبي الفیض المنوفي، ل٩٩، والمنقذ من الضلال: أبي حامد الغزالي، ل٢١٢.

ڕەوشت وخوا پەرستیان تەواو پڕاو پڕ واتای وشەی سۆفی بوون، لەپێش ئەو سەردەمەدا بەو کەسانە دەوترا سۆفی کە دنیا نەویست بوون وە خۆیان یەکلاکردبوویەوە بۆ پەرستش وە ئەمەش ئاساییە، چونکە هەموو شتێك بەپێی تێپەڕبوونی کات وبەرەو پێش چوونی هەموو پەیڕەو وبەرنامەیەك ڕوو دەدات[1].

لە سەدەی سێیەمی هیجریدا بەتەواوەتی تەسەووف پەرەی سەند لەولاَتی عێراقدا وبەغداد بوویە ناوەندی سەرەکی بۆ بزووتنەوەی سۆفیگەری، چەندەها قوتابخانە وفێرگە کرانەوە کە پەیڕەو وبەرنامەی تایبەت بە خۆیان هەبووە و جیاواز بوون لە یەکتر، هەر یەکێکیان پێشەوا ومووریدی تایبەت بەخۆی هەبوون، تەسەووف لەم سەردەمەدا بەرەو پێش چونێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی وەچەندەها کەسایەتی ناسران ودەرکەوتن وەکو محاسبی وزەلنوونی میصری[2]وجونەیدی بەغدادی «خوالێیان خۆش بێت» وجگە لەوانیش، باری ئابووری ئەو سەردەمە هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ هاندانی خەڵکی بۆ ژیانێکی ڕۆحی وپڕاو پڕ لە تەسەووف، لە ڕاستیدا ئەوەی بەرچاومان ئەکەوێت لەو سەردەمەدا مەشغوڵ بوونی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە ململانێی دەسەلاَت ودروستکردنی دەوڵەتی عەباسی بوو، وە پەلاماردانی فارسەکان بۆسەر دەوڵەتی مسوڵمانان[3]،لەبەر ئەم هۆکارانە وچەندەها هۆکاری تر کە کاریگەرییان

---

(١) نشأة التصوف الإسلامي: ابراهيم بسيوني، دار المعارف- قاهيره، چ١، ١٩٦٩، ل١١١.

(٢) ذو النون: ناوی تەواوی ئەبوو فەیز ثوبان کوڕی ئیبراهیم میصری کە پێشەوایەکی دیاری میصر بووە، لە گوندێکی میصر بەناوی نوبا لەدایك بووە وەپێشی وتراوە (ئیخمیم)، پیاوێکی ڕەوانبێژوو شاعیر بووە، بەیەکەم کەس دەژمێرێت لە میصردا کە قسەی کردووە لەبارەی مەقاماتی ئەهلی ویلایەت، وەفەرموودەیەکی زۆری گێڕاوەتەوە لە مالیك ولەیپی کوڕی سەعد وسوفیانی کوڕی عینە وفوزەیڵی کوڕی عەیاز وچەندین کەسی تر، وەفاتی فەرموو خوای گەورە لێی ڕازی بێت، لەساڵی ٢٤٦ کۆچی، {صفة الصفوة: جمال الدين أبو الفرج عبد الرحمن بن علي بن محمد الجوزي، المحقق: أحمد بن علي، دار الحديث-قاهيره، ١٤٢١ك-٢٠٠٠ز، (ب٢/ل٤٤٤)، وحلية الأولياء وطبقات الأصفياء: أبو نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني، چ٢، دار الكتاب العربي- بەيرووت، ١٤٠٥ك، (ب٩/ل٣٣١-٣٩٥)، الطبقات الكبرى: لإمام عبد الوهاب الشعراني، (ب١/ل٧٠)}.

(٣) ضحى الإسلام: احمد أمين، دار الكتاب العربي- بەيرووت، چ١٠، (ب١/ل١٨٢-١٨٥)، والتصوف النفسي: عامر النجار، الهيئة المصرية العامة للكتاب-ميسر، ٢٠٠٢ز، ل١١-١٩.

هەبووە لەسەر برسێتی وهەژاری خەڵکی کە هۆکار بووە بۆ چوونە ناو ڕێگای تەسەووف، چونکە ئەیانزانی دونیا وخۆشیەکانی کەم وکاتین، وەخۆشی ڕاستەقینە چوونە بەهەشتە کەپێویستە هەوڵبدرێت لەپەرستشدا بۆ گەشتن بەو خۆشیانە(١).

لەدوای ئەمە ئەتوانین بڵێین: هەمووی ئەمانەی کە لە پێشدا باسمان کرد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سۆفی ڕێباز وگروپێك نیە کە بیرو باوەڕێکی تایبەت بەخۆی هەبێت بەڵکو ڕێگەیەکە بۆ سەرنجدان ووردبوونەوە وخۆخەریك کردن بەچاك کردن وپاککردنەوەی دڵ وهەستکردن بەچاودێری خوای پەروەردگار(٢).

(١) فلسفة الحياة الروحية منابعها ومشاربها ونشأتها ونشأة التصوف والطرق الصوفية: مقداد يالجن، ل٨٠.

(٢) بين السلفية والصوفية الإعتقاد الصحيح والسلوك السليم: زاهد يحيى الزرقي، ل١٦.

## باسی سێیەم: قوتابخانە وڕێبازە وتەسەووفییەکان

تەسەووف وەکو کۆمەڵە وگروپ سەری دەرهێنا ولەناو مسوڵمانان چەند تەریقەتێکی جیاوازی تەسەووفی پەیدا بوو، ڕێبوار «سالك» بۆ ئەوەی بگاتە پلەی کامڵ بوون، دەبوایە بە چەند مەقام وحاڵێکدا بڕوات وبگاتە ناسین ولەدوایشدا بگاتە حەقیقەت، بێگومان بە پەیڕەویی شەریعەتەوە ڕێبوار دەگەشتە ئەم پایەیە[(١)].

ئێستاش باسی مێژوو ودروست بوونی چەند ڕێبازێکی تەسەووف دەکەین:

### یەکەم: ڕێبازی قادریی:

ئەم تەریقەتە بەناوی «عەبدولقادری کوڕی شێخ مووسای کوڕی شێخ عەبدوڵڵای گەیلانی» ناوبانگی دەرکردووە ولە«٤٧٠ك -١٠٧٧ز» لە نیقی سەر بەشاری گەیلان لەدایك بووە[(٢)] ولە «٥٦١ك-١١٦١ز» لە بەغداد وەفاتی کردووە ولەو قوتابخانەیەی دەرسی تێدا دەگوتەوە بەخاك سپێردراوە وئێستا لەغداد مەزارگەی مسوڵمانانە، گەیلانی زانستی تەریقەتی لە «ابو الخير حماد بن مسلم الرباس» وەرگرتووە وغەرقەی تەسەووفیشی لە «ابو سعيد المخرمی»یەوە پێ گەیشتووە[(٣)].

ئەم تەریقەتە لە سەرەتاوە لە «جونەیدی بەغدادی»ەوە هاتووە کە بریتی بوو لە قوتابخانەیەکی بیروباوەڕی ودوایی بەرەو تەسەووف چووە لە بەغداد[(٤)].

ئیبن تەیمیە لەبارەی شێخ عبدالقادری گەیلانیەوە دەفەرموێت: "شێخ عبدالقادر وهاوشێوەی ئەو یەکێکن لە شێخە گەورەکانی سەردەمی خۆیان بۆ پابەند بوون بەشەریعەت وئەمر ونەهیەکان، وە

---

(١) تأريخ تصوف در إسلام: قاسم غنى، ل ٤٥٩-٤٦٠.

(٢) المنتظم في تاريخ الملوك والأمم: عبد الرحمن بن علي بن محمد بن الجوزي أبو الفرج، دار صادر – بەيرووت، چ١، ١٣٥٨ك، (ب ١٠/ل٢١٩)، والعقد الثمين في شرح أحاديث أصول الدين: حسين بن غنّام النجدي الأحسائي المالكي، المحقق: محمد بن عبد الله الهبدان، فهرسة مكتبة الملك فهد الوطنية- سعوديه، چ١، ١٤٢٣ك/٢٠٠٣ز، ل ١٨٠.

(٣) الفتح الرباني والفيض الرحمانى: عبدالقادر الكيلاني، دار الريان التراث-ميسر، چ١، ل ٥-٦، و مرآة الجنان وعبرة اليقظان في معرفة ما يعتبر من حوادث الزمان: أبو محمد عفيف الدين عبد الله بن أسعد بن علي بن سليمان اليافعي، وضع حواشيه: خليل المنصور، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١، ١٤١٧ك – ١٩٩٧ز، ( ب٣/ل٢٠٣).

(٤) العقل الصوفي في الإسلام: علي شلق، دار المدى- بەيرووت، چ١، ١٩٨٥ز، ل٥٣-٥٦.

شەریعەتیان پێش خستووە بەسەر جۆرەکانی چێژدا، وە یەکێکە لە شێخە گەورەکان کە فەرمانی کردووە بە وازهێنان لە هەوا وویستی نەفسدا"[١].

ئەم تەریقەتە بلاوبوویەوە وناوبانگی دەرکرد لە زۆرێك لەولاتانی جیهاندا وەك سوریا وتورکیا وعێراق ومەغریب وجەزائیر وفەلەستین ولوبنان ومۆزەمبیق وکامیرۆن ونێجیریا و چین ویەکێتی سۆڤێتی وگانا وئێران وسودان ونەیجیر وغینیا وتشاد وئەفغانستان وپاکستان وسۆمال وئەندەنوسیا ویوغسلافیا ومیصر وتونس ومالیزیا وئەرتیریا[٢].

تەریقەتی قادری دژایەتی لەگەل شەریعەت نەبووە وموو بەموو لەگەلی ڕۆشتووە ودژی حالەتی مەستی بووە وقسەی حەللەق ومەللەقی «شطحات» لاپەسەند نەبووە وتەریقەتەکەی بریتی بووە لە بەیەك زانینێکی پاکی خوا کە دووربێ لە هەموو جۆرە هاوبەشییەکی ئاشکرا ونهێنی[٣].

ئەم تەریقەتە لە ئەسلدا شوێن قورئان وسوننەت کەوتوون وە شێخ عبدالقادری گەیلانی دەفەرموێت "بفڕە بۆلای خوای گەورە وبالادەست بە بالەکانی قورئان وسوننەت"[٤]، لەلایەکی ترەوە گەیلانی دژی تەمبەلی وتەوەزەلی بووە وڕووی کردووەتە موریدەکانی وپێی فەرموون خوای گەورە بپەرستن وهەول بۆ بەندایەتیەکەتان بدەن بە کاسبی و ئیشی خەلال[٥].

موریدەکانی ئەم تەریقەتە پێیان دەوترێت «دەروێش» وبە شوێنی زیکرەکانیشیان دەوترێت «تەکیە» واتە شوێنێکی بەرزی تەپۆلکە ئاسا، یاخود بەمانای «سەکۆ» دێت[٦].

(١) مجموع الفتاوى: تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، المحقق: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم، مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف- مەدینەی منەوەرە، ١٤١٦ك/١٩٩٥ز، ( ب١٠/ ل٤٨٨).

(٢) جغرافية الباز الاشهب: جمال الدين فالح الكيلاني، المنظمة المغربية للثقافة والعلوم – مەغریب، چ٣، ٢٠١٤ز، ل١٢٢.

(٣) الطرق الصوفية في مصر نشأتها ونظمها وروادها: عامر النجار، دار المعارف- میسر، چ٥، ل٧٧.

(٤) الفتح الرباني والفيض الرحماني: عبدالقادر الكيلاني، ل ١٧٩.

(٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨٦.

(٦) مشتێلە بێژەی عارفی و کردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل ٨٢).

## دووەم: ڕێبازی نەقشبەندی:

وشەی «نەقشبەند» وشەیەکی فارسییە ولە دوو بەش پێکهاتووە «نقش» وێنەی ئەو مۆرەیە کە لەسەر مۆم وشتی تر دەدرێ، «بند» بە واتای چەسپان ونەکوژانەوەیە، کەوابوو وشەکە بەگشتی واتای ئەوە دەگەیەنێ کە زیکری خوا کار لەدڵ دەکا ولەناخیا دەچەسپێت[١].

یان بەشێوەیەکی تر لەبەر ئەوەیە کە سوورەت وصیفەتی کەمالی حەقیقی کەپەیێوەندی تەواو حوزووری دڵە بەتەوەجوهاتی پیر لەدڵی مریدا نەقشی بەستووە، یان لەبەر ئەوە کەزیکری ناوی خوا لەدڵی مریددا دامەزراوە ونەقشی بەستووە[٢].

ئەم تەریقەتە لە ئەساس وبنەڕەتدا «شێخ محمد بەهائەدین شاهی نەقشبەند» دامەزرێنەری بووە، وئەو ناوەی لێنراوە و بەوە ناسراوە، لە گوندی بوخارا لە ساڵی «٧١٧-٧٩١» لەدایك بووە، ئەم تەریقەتە بڵاوبوویەوە لە شام لەدوای ئەوەی کە ئەم تەریقەتەیان لە «عبداللە دهلەوی» وەرگرت، ئەم تەریقەتە تەنها لە بوخارا وئێران وتورکیا وعێراق ومیسر وسوریا بڵاو بوویەوە[٣].

ئەوانەی لەسەر ئەم تەریقەتەیان نووسیوە سەرەتا بۆ«ئەبووبەکری صدیق»ی دەگێڕنەوە وناویان لێناوە «صدیقیە» وباوەڕیان وایە کە ئەبوو بەکر دایمەزراندووە، ودەیگێڕنەوە سەر پێغەمبەر ﷺ بەبەڵگەی ئەوەی کە «ئەبووبەکر» جێگری پێغەمبەر بووە ولەکۆچەکەی بۆ مەدینە هاوڕێی بووە، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێت "ما صب الله في صدري شيئاً إلا صبّته في صدر ابي بكر"[٤] واتە: خوا هیچی نەڕژاندەووەتە سنگی منەوە کە نەیڕژاندبێتەوە سنگی ئەبووبەکرەیشەوە، بێگومان ئەم خستنە دڵەش لایەنێکی مەعنەوییە وزیاتر کەسێتی ئەبووبەکر دەچەسپێنێ، ئەم تەریقەتە هەر بەو ناوە مایەوە تا سەردەمی «ئەبوو یەزیدی بەستامی»، ئینجا ناونرا «طيفورية» تا سەردەمی «عەبدول خاڵقی غەجدەوانی»، لەمەوە ناونرا خواجەگانی تاکانی «محمد بەهائەدین

---

(١) الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية: محمد بن سليمان، ئەستەنبوڵ- توركيا، ١٩٩٢ز، ل٢١.

(٢) یادی مەردان: مەلا عبدالكريمی مدريس، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد-بەغداد، چ١، ١٩٧٩ز، (ب١/ل١٣٣).

(٣) مشتێلە بێژەی عارفی و کردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل ٧٣)، و البهجة السنية في آداب الطريقة العلية النقشبندية: محمد بن عبد الله الخاني، مكتبة الإخلاص- توركيا، ل٣٥.

(٤) الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية: محمد بن سليمان، ل١٢.

نەقشبەندی» ناوی لێنرا تەریقەتی «نەقشبەندی» وتائێستاش هەر وای پێ دەڵێن، بەلاّم لەلایەکی ترەوە بیرو باوەڕی وا هەیە کە لەسەردەمی «شێخ عەبدوڵلاّی ئەحرار» تەریقەتەکە بووەتە «احرارية» تا سەردەمی «ئیمامی ڕەببانی»کە بەنوێ کەرەوەی هەزارەی دووەمی کۆچی ناسراوە وناویان لە تەریقەتەکە نا «مجددية» تاپەیدا بوونی «مەولانا خالیدی نەقشبەندی» وتەریقەتە کە ناونرا «خالیدية»[1].

زیکر لای نەقشبەندییەکان بریتیە لە نەهێشتنی بێ ئاگایی ئەمەش دوو جۆرە بە زمان وبەدڵ[2]، زیکری دڵی شکە تایبەتە بەم تەریقەتە دەبێتە دوو بەش:

أ. زیکری بەناوی خود واتە ناوی «الله»، لە ئیمامی ئەبووبەکرەوە وەرگیراوە.

ب. زیکری بە ئەرێ ونەرێ «النفي والاثبات» واتە بە «لاإله إلا الله»، لە ئیمامی «عەلی کوڕی ئەبی تالیب» وەرگیراوە[3].

موریدەکانی سەر بەم تەریقەتە پێیان دەڵێن «سۆفی» پیرەکانیان بە «شێخ» ناودەبەن وشوێنی زیکر وتەهلیلەکردنیان وحەڵقە وکۆڕی تێدا دەبەستن پێی دەوترێت «خانەقا»، ئەم وشەیە لە «خانەی بەقا»وە هاتووە ومانای جێی مانەوەی سۆفیان بۆ زیکر وتەهلیلەکردنیان دەگەیەنێت[4].

## سێیەم: ڕێبازی ڕەفاعی:

ئەم تەریقەتە «سەید ئەحمەدی ڕووفاعی» دامەزرێنەرێتی ولەسنووری قورئان وفەرموودە دەرنەچووە ودژی مرۆڤی تەمبەڵ وبێکار بووە، بۆیە دەڵێ:"بێ ئیش و بێ کاری لەناو ڕیزەکانی ئێمەدا نیە"[5] ئەمەش دژی ڕای «هیلر»ە کە دەڵێ: "لەهەر شوێنێ تەسەووف پەرەی سەند ئەوا ئابووری ئەو شوێنەی بەرەو ڕووخان دەچێت"[6].

---

(١) السعادة الابدية فيما جاء النقشبندية: عبدالمجيد النقشبندي، مكتبة الحقيقة، ئەستەنبوڵ- تورکیا، ١٩٩٢ز، ل٢١.

(٢) الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية: محمد بن سليمان، ل١٣، السعادة الابدية فيما جاء النقشبندية: عبدالمجيد النقشبندي، ل٢٨.

(٣) تاريخ عجائب الآثار في التراجم والأخبار: عبد الرحمن الجبرتي، تحقيق: عبدالرحيم عبدالرحمن عبدالرحيم، تقديم: عبدالعظيم رمضان، دار الكتب المصرية- قاهيرە، ١٩٩٨ز، (ب١/ل٣٤٦).

(٤) مشتێلە بێژەی عارفی و کردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل٨٢).

(٥) الطرق الصوفية في مصر نشأتها ونظمها وروادها: عامر النجار، ل٩٢.

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤١.

ئەم تەریقەتە لەسەدەی حەفتەمی کۆچیدا لە میسر بڵاوبوویەوە وزیکریان وەکو قادرییەکان بە ئاشکرایە[1].ئەم ڕێبازە داوا لە ڕێبوارانی دەکات کە جل وبەرگی تایبەتی لەبەربکەن وکڵاوی سوور دروشمی بوو، لەدوای «سەید ئەحمەد» پێڕەوانی لە ڕێگای ئەو لایان داوە[2].

## چوارەم: ڕێبازی بەدەوی:

دانەرو دامەزرێنەری ئەم تەریقەتە «سەید ئەحمەدی کوڕی سەید عەلی کوڕی سەید ئیبراهیم»ە، «سەید ئەحمەد» لەقەب ونازناوی شێخ وتەریقەتی بە «ئەلباری» دەرکردووە وناسراوە، تەریقەتی «بەدەوی» زیاتر لەهەموو تەریقەتەکانی تر نفوس ودەسەلاتی لە ولاتی میسردا هەیە وهەبووە، ئەویش لەبەر ئەوەی زیاتر لە تەریقەتی «ڕەفاعی» تیژڕەو وتوندترە بۆ ئاینداری ودینپەروەری و شەریعەتەکە، سوونی مەزهەبن وپەیڕەوی ئیمامی شافعیی دەکەن[3].

«بەدەوی» کەسێکی خۆنەویست وزاهید بووە ولە سنوری شەریعەت دەرنەچووە لەم باریەوە دەفەرموێت: "تەریقەتەکەمان لەسەر قورئان وسونەت وڕاستگۆی ووەفا وڕەوشت جوانی وهەڵگرتنی ئازار وپاراستنی پەیمانەکان بنیاتنراوە"[4].

## پێنجەم: ڕێبازی شازلی:

ئەم تەریقەتە، کە بە «تەریقەتی شازلی» ناسراوە ولەتەریقەتەکانی تر جیاوازە، زانا وعالمی گەورە ولێهاتوو «شێخ عەلی عەبدوڵلا عەبدوالجبار» نازناو بە «شازلی» دانەر ودامەزرێنەری بووە.

ئەم شێخ وزانا بلیمەت وژیرە، گوندنشینی «غەمارە»ی شاری «سبتە»یە، وهەر لەوێشدا چاوی بەدنیا هەڵهێناوە ولەدایك بووە، ئینجازەی شێخایەتی وسۆفیگەری بوونی لە خزمەت زانا وشێخی گەورە وناودار ئیمام «عەبدوڵلا ئەبو حەسەن» وەرگرتووە.

ئەم تەریقەتە وێنەی تەریقەتی «ڕەفاعی» و«بەدەوی» لەولاتی میسردا بڵاوەی کردووە وهەیە[5].

---

(١) تأريخ الطرق الصوفية: يونس السامرائي، مكتبة الشرق الجديد- بەغداد، چ١، ١٩٨٨ز، ل٣٤.

(٢) الطرق الصوفية في مصر نشأتها ونظمها وروادها: عامر النجار، ل٩٩.

(٣) مشتێلە بێژەی عارفی و کردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل٦٩).

(٤) تأريخ الطرق الصوفية: يونس السامرائي، ل٣٦.

(٥) مشتێلە بێژەی عارفی و کردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل٧١).

«شازلی» دژی کۆنه پۆشین بووه وتەریقەتەکەی ڕەبەنایەتی نەبووە، جگە لەمەش خەباتگێڕێکی بەجەرگ بووە ولەجەنگی خاچییەکان بەشدار بووە، ئەمەش بەرپەرچدانەوەی ئەوانەیە کە دەڵێن سۆفییەکان گۆشەگیر ودوورە ژیانن، «شازلی» باوەڕی بە«نووری محمەدی» هەبووە ولەدەستوورەکانی شەرع لای نەداوە و دەڵێ: "ئەگەر شتێکت لە قورئان وفەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ، هەستت پێکرد وکەشفت کرد، ئەوا دوور بکەرەوە لە کەشفکراوەکە وبە نەفسی خۆت بڵێ خوای گەورە قورئان وفەرموودەکانی داناوە پارێزگاری لێ دەکات، بەڵاّم کەشفکراوەکەی دانەناوە نەپارێزراوە نە لەڕووی نیگا وئیلهامەوە و نە لە ڕووی بینین ومشاهەدەوە"[1].

خۆیان بە ئەهلی بەیت داناوە ودوای قورئان وفەرموودەکانی پێغەمبەر کەوتوون، ئەمانیش کتوومت پەیڕەوی شەرع و شەریعەتیان کردووە، تەنانەت بۆ ئەوەش بەدوای شتە دەگمەن وجوان وڕازاوەکاندا گەڕاون وبۆڵبژێری شتە دانسقەکان بوون[2].

## شەشەم: ڕێبازی ئەلدەسووقی:

دامەزرێنەری «ئیبراهیمی کوڕی عەبدول عەزیزی دەسووقیی»ە ودەگەڕێتەوە سەر حەزرەتی «حوسێن»، «دەسووقی» بەبێ ڕابەر پێگەیشتووە ودەڵێ: "ئەگەر کەسی خواناس کامل بوو لە مەقام وپلەی خواناسان دا بوو، ئەوا خوای گەورە دەیکاتە میراتگری زانستێك بەبێ ناوەندێك وواسیتەیەك"، هەروەها باوەڕی بە«نووری محەمەدی» هەبووە وپابەندی شەریعەت بووە، لە بارەی زیکرەوە وەکو «قادری» و «ڕوفاعی»یەکانە وجل وبەرگی سوور نیشانەی تەریقەتەکەیەتی، تەریقەت لای ئەو دوو وشەیە «خوا بناسی وبیپەرستی»[3].

جا لەبەر ئەوە ئەم بنەماڵەیە و هەم تەریقەتەکەشیان بەنوور وتەجەلی وەرگرتنی «ڕووناکی ونووری» ئەلمحەمەدییە دادەنێن.

---

(١) الطرق الصوفية في مصر نشأتها ونظمها ورودها: عامر النجار، ل١٩٩-٢٠٨.

(٢) مشتێلە بێژەی عارفی و کردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل٧١).

(٣) الطرق الصوفية في مصر نشأتها ونظمها ورودها: عامر النجار، ل ٢٣٦-٢٤٧.

لەكارە شەریعەتییەكاندا، مورید سۆفییانی سەر بەو تەریقەتە، بێ لە یاسا ودەستوورەكانی قورئانی پیرۆز وگەورە زیاتر پشت وپەنا بەستنیان لەهەموو سوونەتەكانی تر، بەسوننەی محەمەدییە كاری پێ دەكەن..

لەبارە وبوارەكانی زكر وتەهلیلەكردنی كۆڕ ودانیشتەكانی تەریقەتەكەیاندا وەك تەریقەتەكانی «قادری» و «ڕوفاعی» عەمەل وكاری پێ دەكەن، لەكاتی ئەو زیكر وتەهلیلەیاندا، جلوبەرگی تایبەتی دەپۆشن، ئەو جل وبەرگانەیان جیاوازە لەجل وبەرگی ئاسایی ڕۆژانەیان..

هەردەم وهەمیشە خۆیان بە ئەهلی بەیت داناوە، وخۆیان بەنزیكترین نەوەی پێغەمبەر ﷺ حساب كردووە، ئەم دانان وحساب كردنانەیان بەو جۆرە وڕەنگە، ئەوەیە كە ڕەچەڵەك وڕەگەزیان دەگەڕێننەوە سەر ئیمامی «حوسێنی كوڕی خەلیفە ئیمام عەلی»، كە«ئیمام عەلی»ئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ و هەم زاوایەتی[1].

ئەم تەریقەتە زیاتر لە میسر وسودان ولیبیا وتونس وجەزائیر ومەغریب وسوریا وئەردەن وسعودیە وپاكستان ولوبنان هەیە.

چەندین تەریقەتی تر هەن لێرەدا تەنها ئاماژە بەناوەكانیان دەكەین، بەكورتی[2]:

**حەوتەم**: **ڕێبازی سەعدیە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ سەعدەدینی جەباوی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٥٧٥ كۆچی وەفاتی كردووە، ئەم ڕێبازە لە شام ئەنباردا بلاۆبووەتەوە.

**هەشتەم**: **ڕێبازی سوهرەوەردی**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ شەهابەدینی كوڕی سوهرەوەردی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٦٣٢ كۆچی وەفاتی كردووە، ئەم ڕێبازە لە عیراق وكشمیر وپاكستان وئەفغانستان ومیسر وكوردستاندا بلاۆبووەتەوە.

**نۆیەم**: **ڕێبازی ئەكبەرییە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محێدینی عەرەبی» دەگەڕێتەوە كەناسراوە بە شێخی گەورە، لە ساڵی ٦٣٨ كۆچی وەفاتی كردووە، ئەم ڕێبازە لە میسر وسوریا ومەغریب وئیحسادا بلاۆبووەتەوە.

---

(١) مشتێلە بێژەی عارفی و كردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، (ب١/ل٧٠).

(2) https://ar.wikipedia.org/wiki/صوفية

**دەیەم: ڕێبازی قزلباشییە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ صەفیەدینی ئیسحاقی ئەردەبیلی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٧٣٠ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە ئەفغانستان وتورکیادا بڵاوبووەتەوە.

**یانزەیەم: ڕێبازی بەکتاشیە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی بەکتاش» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٧٣٨ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە ئەلبانیا وڕۆشهەلاتی بولگاریادا بڵاوبووەتەوە.

**دوانزەیەم: ڕێبازی عروسیە**: دامەزرێنەری بۆ«شێخ ئەحمەدی کوڕی عەروس» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٨٦٩ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە لیبیا وتونس دا بڵاوبووەتەوە.

**سیانزیەم: ڕێبازی عیساویە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محەمەدی کوڕی عیسی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٩٣٣ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە جەزائیر ولیبیا وتونس ومەغریبدا بڵاوبووەتەوە.

**چواردەهەم: ڕێبازی خەلوتیە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محمدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی کەریمەدینی خەلەوتی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٩٨٦ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە میسر وتورکیا وفەلەستین وئەردەن وجەزائیر ولیبیادا بڵاوبووەتەوە.

**پانزەیەم: ڕێبازی سامانیە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محەمەدی کوڕی عەبدولکەریمی سامان» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١١٨٩ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە سودان وسۆماڵ وئەسوبیادا بڵاوبووەتەوە.

**شانزەیەم: ڕێبازی فازلیە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محەمەدی کوڕی فازیلی کوڕی مامین» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١٢١١ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە مۆریتانیا ومەغریب وسەنیگال وئەفریقیا بڵاوبووەتەوە.

**حەڤدەیەم: ڕێبازی تاجیانی**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ ئەبو عەباسی کوڕی ئەحمەدی تاجیانی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١٢٣٠ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە جەزائیر ومەغریب وتونس وسەنیگال و نەیجیر ونێجیریا وحیجاز وسوداندا بڵاوبووەتەوە.

**هەژدەیەم: ڕێبازی ئیدریسی**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ ئەحمەدی کوڕی ئیدریسی فاسی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١٢٥٣ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕێبازە لە سودان وسۆماڵ بڵاوبووەتەوە.

**نۆزدەهەم**: **ڕێبازی مەولەوی**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ جەلالەدینی ڕۆمی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ٦٧٢ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕیبازە لە تورکیا وحەلەب وئاسیای ناوەڕاست وعیراق ومیسر وبۆسنە وتونس ورۆژئاوای بەیروت بلاۆبووەتەوە.

**بیستەم**: **ڕێبازی خەتمیە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محمدی کوڕی عوسمانی میرغەنی خەتمی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١٢٦٧ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕیبازە لە سودان وئریتریا وئەسیوبیا وسەنیگال بلاۆبووەتەوە.

**بیست ویەکەم**: **ڕێبازی سەنوسی**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محمەدی کوڕی عەلی سەنوسی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١٢٧٦ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕیبازە لە لیبیا وباشووری ئەفریقیا وسودان وسۆماڵ ورۆژئاوای ئەنباردا بلاۆبووەتەوە.

**بیست ودووەم**: **ڕێبازی کەسنەزانی**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ عەبدولکەریمی شاهی کەسنەزان» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١٣١٧ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕیبازە لە سنە وعێراق وکوردستاندا بلاۆبووەتەوە.

**بیست وسیٚ یەم**: **ڕێبازی عەلاویە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ ئەحمەدی مەستەفای عەلاوی» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١٣٥٣ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕیبازە لە جەزائیر وتونس ومەغریب وسەنیگالدا بلاۆبووەتەوە.

**بیست وچوارەم**: **ڕێبازی جەعفەریە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ سالح عمر جەعفەری ئەلحسێنی ئیمامی ئەزهەر» دەگەڕێتەوە، لە ساڵی ١٣٩٩ کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم ڕیبازە لە مەغریب وسەنیگال ورۆژ ئاوای ئەفریقیادا بلاۆبووەتەوە.

**بیست وپێنجەم**: **ڕێبازی بودشیشیە**: دامەزرێنەری بۆ «سەید عەلی کوڕی محمد» دەگەڕێتەوە، کەناسراوە بە سەید عەلی بودشیش، ئەم ڕیبازە لە مەغریبدا بلاۆبووەتەوە.

**بیست وشەشەم**: **ڕێبازی کەڕکەڕییە**: دامەزرێنەری بۆ «شێخ محمەدی کوڕی فەوزی کەڕکەڕی» دەگەڕێتەوە، تا ئێستاش لەژیاندا ماوە، ئەم ڕیبازە لە مەغریب وپاکستان ومیسر وسعودیە وجەزائیر وتونس ولیبیا وئەنبار وسودان وتورکیا و لوبناندا بلاۆبووەتەوە.

## باسی چوارەم: هاتنی هەردوو ڕێبازی قادری ونەقشی بۆ کوردستان

### ▪ هاتنی ڕێبازی قادری بۆکوردستان:

تەریقەتی «قادری» کە هەموو ڕۆژهەڵاتی گۆی زەوی گرتەوە دامەزرێنەرەکەی «شێخ عەبدولقادری گەیلانی»بوو، ئەو تەریقەتەکەی داهێناوە دامەزرێنەری تەریقەتی «قادری» ناوی «عەبدولقادری کوڕی ساڵحی کوڕی محێدین»ە، لە ساڵی «١٠٧٧ز» لە گوندی «نایف» لە ناوچەی «گەیلان» لە باشوری دەریای «قەزوین» لە دایك بووە لەتەمەنی «١٨» ساڵیدا لە ساڵی «١٠٩٥ز» بۆ خوێندن ڕوو کردۆتە بەغدا هەموو قۆناغەکانی خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە لە دواییدا ژنی هێناوە ئینجا چووە بۆ حەج.

لە ساڵی «١١٣٠ز» تەریقەتی سۆفییەتی لە «ئەبو لخەیر محەمەد» وەرگرتووە شێخەکەی نازناوی «بازی ڕەش» «باز الله الاشهب» پێبەخشیوە.لە دوای ئەوە دەستی کردووە بە وەعز وئیرشاد رۆژ لەدوای رۆژ ژمارەی گوێگرانی لە زیاد بوون دابووە ڕەمزی دیاری تەریقەتەکەی لە بەر کردنی جلی شڕی کۆنە بووە نێوەندی ئیرشاد و وەعزی تەسەووفی وشەریعەتی «شێخ عەبدولقادر» لە تەکیەیەك بوو لە دەرەوەی شار لە ساڵی «١١٣٣ز» تەکیەکی بۆ بینا کرا خۆی بەڕێوەی دەبرد لە رۆژانی هەینی وئێوارانی دووشەمە خوتبە و وەعزی بۆ خەڵکی دەدا.

هەندێ لە قوتابی و موریدانی شێخی گەیلانی گەیشتە پلەی وەزیری دەوڵەت و والیی ویلایەت هەندێ جار خەلیفە و والییەکان پرسیان پێدەکرد گوێیان بۆ ئامۆژگارییەکانیان شل دەکرد.

شێخی گەیلانی هەموو ژیانی لە بەغدا بردەسەر لە ساڵی« ١١٦٥ز» هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد لە مزگەوتەکەی خۆی نێژراوە مزگەوتەکە ئێستا ناوەندێکی ئاینی و سۆفیزمی زۆر گرنگە لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامی گۆی زەوی بە پیرۆزی ڕووی تێدەکەن.

«شێخ مارفی نۆدەی» تەریقەتی قادری بۆ یەکەمجار وەکو رێبازێك لە «کوردستان» دامەزراند «شێخ مارف» لە ساڵی «١٧٦٦ز» لە گوندی «شارباژێڕ» لە دایك بووە سەرەتای خوێندنی لە «قەڵاچۆلان» خوێندن زانستەکانی ئایینی ئیسلامی لە سەر دەستی «مەلا محەمەدی ئیبنوالحاج» وەرگرتووە زۆربەی دانراوەکانی بە «هۆنراوە» بوونە لەوانە فەرهەنگی «ئەحمەدی» شێخ مارفی نودێ لە ساڵی «١٨٣٦ز» لە سێلمانی کۆچی دوایی کردووە لەسەر گردێك نێژراوە لە دواییدا بەناوی «گردی شێخ مارف» ناسرا.

«شێخ مارفی نۆدێ» بە دامەزرێنەری تەریقەتی قادری دادەندرێت دەستێکی باڵای هەبووە لە پەرەسەندنی تەریقەتەکە لە ڕووی پراکتیکەوە «شێخ مارف» هەموو ئەو سامانە گیانی و رۆشنبیرییەی بۆ «کاکە ئەحمەدی شێخ»[1]ی کوڕی بەجێهێشت هاودەم لەگەڵ زیرەکی خۆی «کاکە ئەحمەد» بووە رێبەری تەریقەتەکە لە کوردستان پلەی رێزلێنانی گەیشتە «شێخ عەبدولقادری گەیلانی» دامەزرێنەری ڕێبازەکە[2].

لە کۆتایی وسەدەی یازدەی کۆچی وسەرەتاکانی سەدەی دوازدەی کۆچییدا بوو، لەسەردەمی سەیدەکانی بەرزنجەدا تەریقەتی «عەلەوییە» و«خەلوەتییە» باوبووە وهەتا کاتی «سەید محەمەدی یۆلیانی» بەرەو بەغدا ڕۆیشت وتەریقەتی قادری لە«شێخ ئەحمەدی ئەحسائی» وەرگرت وگەڕایەوە کوردستان ولەگوندی «قازانقایە» دانیشت ودەستی بە ڕێنمای وئیرشاد کرد ولێی کۆبوونەوە[3].

تەریقەتی قادری لە کوردستانی عێراقدا چەند لقێکی لێ بۆتەوە، لەوانەش «بەرزنجی تاڵەبانی، کەسنەزانی، لەوڵاتی میسریش دوو لقی هەیە قادری قاسمی وقادری فارضی»[4].

«کاک ئەحمەدی شێخ» ڕابەرێکی گەورەی تەسەووف بووە وخزمەتی زۆری خەڵکی کردووە ولەجەنگی ڕووسی وعوسمانیدا هەندێ لەموریدەکانی ناردووە بۆ یارمەتی عوسمانیەکان لە«١٣٠٥ك-١٨٨٧ز» لەسلێمانی وەفاتی کردووە ولە«مزگەوتی گەورە» نێژراوە[5].

---

(١) کاکە «ئەحمەدی شێخ» لە ساڵی «١٧٩٢ز» لە سلێمانی لە دایك بووە لای «شێخ مارفی» باوکی خوێندنی تەواو کردووە لە جیهانی ئیسلامیدا ناوبانگی پەیدا کردبوو کە «سوڵتان عەبدولحەمید» بەمەی زانیبوو ئارەزووی کردبوو چاوی پێبکەوێت، بەڵام نەیتوانی بوو بچێتە ئەستەمبۆڵ «سەید محەمەد موفتی» لە جیاتی خۆی ناردبوو، «کاکەحمەدی شێخ» لە ساڵی «١٨٨٧ز» لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد لە «مزگەوتی گەورە» بە خاك سپێردرا.

(٢) وتارێك بە ناونیشانی (مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس لە نێوان تەریقەتی قادری و نەقشبەندی دا) نوسینی: محەمەد عومەر، لەبەرواری (١٢/فبرایر/٢٠١٥) لە پێگەی (نوچەنێت):

http://www.nuche.net/?p=27810 .

(٣) کۆمەڵناسی کوردەواری: حوسێنی خەلیقی، چاپخانەی حەوادیس-بەغداد، چ١، ١٩٩٢ز، (ب٢/ل٢٦٠).

(٤) تأريخ الطرق الصوفية: يونس السامرائي، ل ٣٢.

(٥) تأريخ السليمانية وانحائها: محمد امين زكي، ترجمة: جميل الروزبياني، طبع شركة النشر والطباعة العراقية المحدودة- بەغداد، ١٩٥١ز، ل٣٢.

یەکێك لە کوڕەکانی «شێخ عەبدولقادری گەیلانی» کە ناوی «شێخ عەبدول عەزیز»ە لە «٥٣٢ك» لەدایك بووە ولە «٥٨٠ك» چووە بۆ جیهاد ولەگەڵ کافرە صەلیبەکاندا جەنگی کردووە وعەسقەلانی گرتووەتەوە، زیارەتی «بیت المقدیس»ی کردووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ عێراق ولەشاری قەعرە «ئاکرێ» لەکوردستانی باکووردا نیشتەجێ بووە ولە«٦٠٢ك» وەفاتی کردووە[١].

«شێخ عەبدول عەزیز» بەدامەزرێنەری تەریقەتی قادری دادەنرێت لەناوچەی «ئاکرێ» داو دوای خۆی یەکێ لەکوڕەکانی کەناوی «شمس الدین» بووە چووەتە شوێنی لەکوردستانی باکوور وئاوەدانی کردۆتەوە وبەناوی خۆیەوە ناوی ناوە وپاشان بە «شمزین» ناوبانگی دەرکردووە وئێستا نەوەی ئەم زاتە «شەمزینی»یان پێ دەڵێن[٢].

دوا کەسێك لە تەریقەتی قادریدا کەشوێنێکی دیاری لە مێژووی کورددا گرتبێت «شێخ مەحمودی حەفیدە» کە«کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محمدی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخە» ولەساڵی «١٩٥٨ز» وەفاتی کردووە.

---

(١) بنەماڵەی زانیاران: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ناوەندی بلاوکردنەوە: کتێبی کانی-سنە، پەخشانگای ئاننا، چ١، ل٣١.

(٢) ژیناوەری زانایانی کورد لەجیهانی ئیسلامەتی: محمد ساڵحی ئیبراهیمی، چاپخانەی مەهارەت-تاران، ١٣٦٤ هەتاوی، ل ١٥٥.

## ▪ هاتنی ڕێبازی نەقشی بۆکوردستان:

تەریقەتی «نەقشبەندی» کە هەموو جیهانی ئیسلامی گرتووە دامەزرێنەرەکەی «شێخ محەمەدی نەقشبەندی»یە بۆ یەکەمجار دامەزراندنی یان تازە کردنەوەی لە دەستی «مەولانا خالیدی شارەزووی نەقشبەندی» بووە .

«شێخ محەمەدی نەقشبەندی» کە بە «شاهی نەقشبەندی» ناسراوە لە ساڵی«١٣١٧ز» لە گوندی کۆشکی «هیندوان» لە نزیك شاری «بوخارا» لەدایك بووە لە ساڵی «١٣٨٨ز» لەهەمان شوێن کۆچی دوایی کردووە لە تەمەنی هەژدە ساڵییدا سەرەتا و دەستورەکانی سۆفیزمی لە «محەمەد بابا ساماسی» شێخی ڕێبەری وەرگرتووە. «مەولانا خالیدی نەقشبەندی»[1] یەکەم کەس بوو تەریقەتی «نەقشبەندی» وەك ڕێبازێك هێنایە کوردستان دامەزرێنەری ئەو تەریقەتەیە لە ناوچەی سلێمانی وکوردستان.

کەسایەتی «مەولانا خالید» زۆر بڵند بوو بە هۆی ئەوەی هەندێ مورید وسۆفی کردیانە شێخی خۆیان دەروێشی قادری لێکەوتنە تەقە ناخۆشی کەوتە نێوانیان لەو ماوەدا «شێخ مارفی نۆدێی» بەهێزتر بوو «مەولانا خالید» بەناچاری سلێمانی بەرەو بەغدا جێهێشت. لەو سەردەمەدا «مەحمود پاشای عەبدوڕەحمانی پاشای بابان» لە بەغدا بوو تکای لە «مەولانا خالید» کرد بگەڕێتەوە سلێمانی بە قسەی ئەو گەڕایەوە خانەقایەکی بۆ دروست کرد کەوتەوە کاری ئیرشادەوە، تەریقەتەکەی پەرەی سەند مورید و سۆفی زۆر بوون ئەمە بووە هۆی ئاژاوە ودوژمنکاری لە نێوان زانایانی ئایینی و

---

(١) مەولانا خالیدی نەقشبەندی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسێنە ولە تیرەی میکاییلی عەشیرەتی جافە لە ساڵی ١٧٧٩ لە قەرەداخ لە دایك بووە زانستی ئایینی لە زانا گەورەکانی ئەو سەردەمە لە قەرەداخ و سلێمانی و شاری سنەی ئەردەڵان وەرگرتووە لە ساڵی ١٨٠٥ چووە بۆ حەج لە ساڵی ١٨٠٧ چووە ڕووی کردۆتە هیندستان بۆ لای «شا عەبدوڵڵای دهلەوی» یەکێك بوو لە شێخە گەورەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لە هیندستان ساڵێك لای شا عەبدوڵڵا مایەوە لەو ماوەیە هەموو پێویستییەکانی وەرگرتنی تەریقەتی بە جێهێناوە لەسەر دەستی شا عەبدوڵڵا تەریقەتی وەرگرت ڕێ خۆشکرد بۆ ئەوەی ببێتە مورشید و شێخی تەریقەت ڕێبازی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستان دابمەزرێننی ولەوێ ئادابی نەقشبەندی لێ وەردەگرێت وهەر زوو دەگاتە قۆناغی خۆی وشێخ عەبدوڵڵا ئیجازەی پێنج تەریقەتی «نەقشبەندی وقادری وسوهرەوەردی وکوبرەوی وچەشتی»ی دەداتێ ولەئیرشادیشدا ئیزنی دەدا، دواتر گەڕایەوە کوردستان ماوەیەك لە سنە مایەوە خەریکی بڵاوکردنەوەی تەریقەتەکەی بوو ئینجا هاتەوە سلێمانی خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆبوونەوە، لەشاری دیمەشق گیانی پاکی بەخودا دەسپێرێ لە ١٨٢٧ز ولەسەر تەپۆڵگەی چیای قاسیوون دەنێژرێ وئێستاش خەڵکی زیارەتی دەکەن {یادی مەردان: مەلا عبدالکریمی مدریس، (ب١/ل٧-٣٤)}.

خوێندەواران، تا وای لێهات هەوڵی کوشتنی «مەولانا خالید» بدرێ، مەولانا هەستی کرد ناتوانێ بەرهەڵستی ئەم دژایەتیە بکات دووبارە ناچاربوو سلێمانی بەرەو بەغدا بەجێبهێڵێت، وادەردەکەوێ قادرییەکان بەغداشیان بە نزیك دەزانی پێیان خۆشبوو مەولانا لەوێ بژی لەوێش بۆ نەکرا بە ئاسودەیی بژی بۆیە بەغدای بەرەو شام جێهێشت، لە شاری «دیمەشق» نیشتەجێ بوو لە پاش ماوەیەکی کەمدا بە نەخۆشی ڕشانەوە لە ساڵی «١٨١٣ز» کۆچی دوایی کرد[١].

ئەو بناغەی «مەولانا خالید» بۆ تەریقەتی «نەقشبەندی» دروستی کرد زوو پەرەی سەند لە هەموو ناوچەکاندا مورشید وموريد وسۆفی پەیدا بوون ئەگەر چی ماوەیەکی کەم لە «کوردستان» بوو لە دوای «مەولانا خالید» نێوەندی ئیرشادی «نەقشبەندی» لە هەموو کوردستاندا بلاۆبووە، بەڵام نێوەندی هەرە گرنگی تەریقەتەکە لە «بیارە» و«تەوێڵە» بوو کە بە پایتەختی تەریقەتەکە ناسراوە موريدە هەرە دیارەکانی ئەمانەن بوون «شێخ عوسمانی تەوێڵە، سەراجەدین ١٧٧٥-١٨٨٠» «شێخ محەمەدی تەوێڵە، بەهادین ١٨١٩-١٨٨٠» «شێخ عومەری تەوێڵە، زیائەدین ١٨٣٩-١٩٠٠»[٢].

چۆنێتی گەیشتنە خوا لای نەقشیەکان دەبێت ڕێبواری ئەم ڕێگەیە پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکات:

یەکەم: دەبێ شێخێکی ڕاستەقینەی تەواو بەڕیگای سۆزەوە ڕێبوارەکە بۆ لای خۆی کێش بکات، دووەم: دەبێ دڵی ڕێبوارەکە بەشێخەکەوە بەند بێ تا دەگاتە پلەی بینین«شهود»، سێ یەم: پێویستە ئەو زیکرانەی «شێخ» پێی ڕادەگەیەنێ جێ بەجێیان بکات، چوارەم: پێویستە دڵی ڕێبوار بەخواوە پەیوەست بێ وهەرگیز فەرامۆشی نەکا وابزانێ کە خوا ئاگای لەهەموو جووڵەیەکی هەیە[٣].

---

(١) مەولانا خالید وتەریقەتی نەقشبەندی: سەید محەممەد تاهیر سەید زادەی هاشمی، وەرگێرانی: دلێر میرزا، چاپخانەی قانع- سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٣٤-٣٥، و ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە: مستەفا عەسکەری، بلاۆکراوەی ئاراس- هەولێر، چ٢، ٢٠٠٨ز، ل ١٧-١٩.

(٢) وتارێك بە ناونیشانی (مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس لە نێوان تەریقەتی قادری و نەقشبەندی دا) نوسینی: محەمەد عومەر.

(٣) الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية: محمد بن سليمان، ل ١٧، تنوير القلوب في معاملة علام الغيوب: محمد امين الكردي الإربلي، ل ٥٠٥.

## بەشی دووەم: مەولەوی ژیان وکەسێتی وبەرهەمەکانی

- باسی یەکەم: کورتەیەك لەژیانی مەولەوی .
- باسی دووەم: شێوە ورووخساری مەولەوی.
- باسی سییێەم: مەولەوی وعەشیرەتەکەی.
- باسی چوارەم: خێزان ونەوەکانی.
- باسی پێنجەم: چەند سەرگوزەشتەیەك لەژیانی مەولەوی.
- باسی شەشەم: بەرهەمەکانی مەولەوی ویەکێك لە شاکارە ناوازەکانی.
- باسی حەوتەم: مامۆستا ومورشیدەکانی مەولەوی.
- باسی هەشتەم: مەولەوی لە دیدی ئەدیباندا.

## بەشی دووەم: مەولەوی ژیان وکەسێتی وبەرهەمەکانی

### باسی یەکەم: کورتەیەك لەژیانی مەولەوی

ناوی «سەید عبدالرحیم»ی کوڕی «مەلا سەعید»ە ولە نەوەی «مەلا یوسف جان»ی کوڕی مەلا «أبوبکر مصنفی چۆڕی»یە کە دەگەڕێتەوە سەر خواناسی بەناوبانگ «سید محمد زاهد» کە بە«پیر خدری شاهۆ» ناوبانگی دەرکردووە. لە وەچەی حەزرەتی «حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبووتالب»ە، خوایان لێ ڕازی بێت، نازناوی شیعریشی «مەعدوومی» بووە ولەناو خەڵك ولە کۆڕی ئەدیبیاندا بە«مەولەوی» ناوبانگی دەرکردبووە .

مەولەوی لە ١٢٢١ك-١٨٠٦ز لە دێی «سەرشاتە» لە ناوچەی «تاوگۆزی»، لە باشووری کوردستان لە خێزانێکی ئایینپەروەری بەحورمەتدا لەدایك بووە و هەر لەسەردەمی منالێدا ماڵی باوکی هاتووە بۆ دێی «بیزاوە» لەنزیکی «هەڵەبجە». لەوێ لای باوکی قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و وردەکتێبە سەرەتاییەکانی فارسی و«صرف و نحو»ی خوێندووە. پاشان لەسەر ئوسوولی فەقێکانی کوردستان چووە بۆ خوێندن بۆ «پاوە» لە ناوچەی «هەورامانی لهون» وپاش ماوەیەك لەوێوە چووە بۆ «چۆڕ» لە«مەریوان» و لەوێیشەوە چووە بۆ «سنە» و لەمزگەوتی «وەزیر» دامەزراوە.

ئینجا چووە بۆ «بانە» ولەوێیشەوە چووە بۆ «سلێمانی» ولە«مزگەوتی گەورە» دامەزراوە، کە لەو کاتەدا هێشتا جەنابی «شێخ مەعرووفی نۆدێ» مامۆستا بووە تێیدا، ئینجا چووە بۆ «هەڵەبجە» و لە«مزگەوتی جامیعە» لای «مەلا سادقی تەوێڵەیی» کە موستەعید بووە لە خزمەتی «شێخ عبدالله خەرپانی»دا، خوێندوویەتی. ئینجا چووە بۆ «قەڵای جوانرۆ» و لە خزمەتی «مەلا موحەممەدی قازی»دا خوێندوویە.

لەوێیشەوە بۆ جاری دووەم لە سەردەمی «ڕەزا قولیخانی والی»دا چۆتەوە بۆ «سنە» ولە مزگەوتی «دارالإحسان» دامەزراوە. ماوەیەکی زیاتر لە جاری پێشوو لەوێ ماوەتەوە، ئەو حوجرەیەی مزگەوتی «دارالإحسان» کە مەولەوی تێدا ژیاوە وژمارە «١٩»یە لەناو حوجرەی مەلایان تا ئێستا خەڵکی بە«حوجرەی مەولەوی» ناوی دەبەن، ئینجا دیسانەوە هاتووەتەوە بۆ «سلێمانی» ولە خزمەتی «مەلا

**عەبدولڕحمانی نوتشەیی»دا کە موفتیی «سلێمانی» ومامۆستای مزگەوتی «مەلکەندی» بووە، خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی دەرس وتنەوەی وەرگرتووە[1].**

**مەولەوی لەدواساڵەکانی ژیانیدا تووشی گەلێك کارەساتی ناخۆش بووە. ئەو کارەساتانەی لە چەند پارچە شیعردا بە سۆزەوە هۆنیوەتەوە. کتێبخانەکەی سووتاوە. «عەنبەر خاتوون»ی خێزانی مردووە کە جێگایەکی تایبەتی هەبووە لەدڵی مەولەویدا، حەوت ساڵ پێش وەفاتی کوێر بووە، هەر ئەم کوێربوونەشی بووە بە هۆی مردنی، ئەوە بووە جارێکیان بۆ سەرخۆشیکردن لە دۆستێکی دەڕوات بۆ «پریس»، کە لە گەڕانەوە دا نزیکی «هانە سوورە» دەبێتەوە بە جڵەوڕاکێشی وڵاخەکەی دەڵێت من چاوم نابینێت، دارتوویەك لەسەر ڕێگەمانە لقێکی لاری هەیە ڕێگەکەی گرتووە، کە گەیشتینە لای پێم بڵێ با سەرم دانەوێنمەوە، قەدەری خوا وادەبێت کە دەگەنە ئەو شوێنە کابرای «جڵەوڕاکێشی وڵاخەکەی» لەبیری دەچێتەوە کە مەولەوی ئاگادار بکاتەوە، مەولەوی سنگی دەدات بە دارەکەدا وبە پشتدا دەکەوێتە خوارەوە لەسەر وڵاخەکە و پشتی دەشکێت ولە ئەنجامی ئەوەدا لە ١٣٠٠ك- ١٨٨٢ز. دا ماڵئاوایی یەکجاری دەکات ولە گۆڕستانی «ئەسحابە» لەنزیکی «سەرشاتە» دەیسپێرن بە خاك[2].**

**مەحوی شاعیر بۆ وەفاتی مەولەوی هاوڕێی ئەم چەند بەیتە شیعرەی نوسیوە:**

**دەوری هەر چاوێکی ئەمڕۆ داوە سەد فەوجی بەڵا**
**دین و دڵ یەغما دەکەن، چاری کەن ئەی شێخ و مەلا**
**وەسیەتی مەجنوونە: هەر کەس دەردی دنیا عارە بۆی**
**خۆ بکا وەك من بە دەردی عیشقی یارێ موبتەلا**

**(١) دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە ولەسەر نوسینی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس، بلاۆکردنەوەی کوردستان-سنە، چ١، ١٣٨٩، ل١٥-١٦، بنەماڵەی زانیاران: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس، ل٣٩١، مەولەوی ژیان وبەرهەمی: محمدی مەلا کەریم، بلاۆکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠١ز، ل٧، مێژووی ناودارانی کورد: بابە شێخ مەردۆخ ڕۆخانی، وەرگێڕانی: ماجد مەردۆخ ڕۆخانی، ڤیپا-ئێران، چ١، ٢٠١١ز، (ب٢/ل٤٤٥)، مێژووی وێژەی کوردی: سدیق بۆرەکەیی، بلاۆکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠٨ز، (ب١/ل٥٤١)، مێژووی ئەدەبی کوردی: مارف خەزنەدار، بلاۆکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠٨ز، (ب٣/ل٣٥١)، مێژووی زانایانی کورد: مەلا تاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی، چاپخانەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠١٠ز، (ب٢/ل٩٧-٩٨)، ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە: عەلی کەندی، چاپخانەی ڕۆشنبیری ولاوان-هەولێر، چ٢، ٢٠٠٩ز، (ب١/ل٤٣٠).**

**(٢) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس، ل١٧، بنەماڵەی زانیاران: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس، ل٣٩٥.**

کـۆتـری دڵ، چـەنـگوڵـی بـازی قـەزا یـەعنی موژەی
دی، بـە زوڵـفی چـوو پـەنـا بـا، کەوتە نێو داوی بەڵا
وەقتی نوێژی سەر جەنازەی بۆ شەهیدی عیشق دۆست
مـەوج ئــەدا ئـەم ئـاسـمـانـانـە لـە دەنـگـی الصّلا
تـا نـەبـووری تـۆ لە سەر، ڕێ ناخەیە مەیدانی عیشق
سـەر لـە پـێـشـی پـێ دەبـێ لـەم ڕێـگـە دانێی اوّلا
تـورکـی مـن کـوشـتارخـانـەی عاشقانی دی، وتی:
مـن بـرنجــی بــر یـزیـد، ئـێـرە ایـکـنـجـی کـربلا
مەحوی ئـەمشەو ئەو پەری شێوەی لە خەو دیی دەبێ
بـۆیـە ئـەمـڕۆ مـەولـەوی کـەوتـۆتـە حاڵی حەلوەلا[1]

مـەولەوی پاش لەدەستدانی عەنبەرخاتوون و حەوت ساڵ بەرلە مردنی هەردوو چاوی کوێر بوون، بەبۆنەی لەدەستدانی سۆمای چاوانییەوە ئەم شیعرەی وتووە:

یـاری وەفـادار شـەرت و بـەیـن بێشۆ
چـون نـووری دیدەی مەعدوومی مەبۆ
وەختێ بەندەی وێش بێحاڵ وە چەم دی
ئـەسـرین وە چەمـدا ڕێـزا و پەشێو بی

واتە: یاری بێ وەفا وگفت وپەیمان لە ئەندازە بەدەر ڕاست وەك ڕووناکی چاوی من ئەبێ، کە منی غولامی خۆی دی حاڵم پەرێشانە، فرمێسکی بەچاوی خۆیدا ڕژاند وتێك چوو[2]. مەبەستی ئەوەیە چاوی بۆ بەشدار بوون لە نارەحەتی حاڵیا کوێر بووە.

---

(١) دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و موحەممەدی مەلا کەریم، چاپخانەی انتشارات کردستان، چ٥، ل٦٠-٦١.

(٢) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل ٥٩٧-٥٩٨.

## باسی دووەم: شێوە وڕووخساری مەولەوی

مامۆستا «عەلائەدینی سەجادی» باسی شێوە وڕوخساری مەولەوی دەکات ودەڵێت: مەولەوی پیاوێکی میانەباڵا وزۆریش لاواز نەبووە، ڕیشێکی تەنکی هەبووە، دوو چاوی گەشی درێژکاری پێوە بووە، هەندێ جار مێزەرەی سپی کوردانە وهەندێ جاریش جامەدانی ئەبەست بەسەرەوە، هەموو دەمێ خەرقەیەکی بەڕەنگی سەوز سەوزکراوی ئاوەڵدامەنی لەبەرکردووە، گاڵۆکێکیشی ئەگرت بە دەستەوە، قسەکانی لەسەرخۆ و پڕمەعنا بووە، جار جار سۆزێکیشی بووە وەك تەعبیر لە نهێنی تەسەووف یان کەون بداتەوە، بە چەند ساڵێکی کەم لە لەپێش مردنیا ئەو چاوە جوانانەی کە دیمەنی تەبیعەت و «سراج الدین»و «خاتوو عەنبەر»ی پێ ئەبینی کوێر بوون، ئەوەندەی تر سۆزی گەیشتە ئاسمان[1].

پیرەمێرد دەڵێت:"منداڵ بووم، لەبیرمە جارێ مەولەوی هاتە ماڵی ئێمە، قاپووتێکی کورکی سەوزی لەبەردا بوو، منیان خستە باوەشیەوە ودەمی ماچ کردم، لە دەمی دەم ماچکردندا چاوم بە چاوی کەوت، بروسکەیەکی پڕ خەندەی لێ ئەبووەوە"[2].

(١) مێژووی ئەدەبی کوردی: عەلائەددین سەجادی، بلاْوکردنەوەی کوردستان-سنە، ١٣٩١ هەتاوی. ل٢٧٩.

(٢) پیرەمێرد وپێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان وبەرهەمەکانی: ئومێد ئاشنا، بلاْوکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠١، (ب١/ل٤٤).

## باسی سێیەم: مەولەوی وعەشیرەتی تاوگۆزی

تاوگۆزی ناوی هۆزێکی کوردە لە ناوچەی تاوگۆزی نیشتەجێن لەسەر سنووری ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان. لە ڕۆژهەڵات دەکەوێتە سنووری هەردوو شارستانی جوانرۆ و تازاوەی سەلاس لە پارێزگای کرماشان. هاوسنوورن لە گەڵ هۆزەکانی باوەجانی و قوبادی و ئیمامی و جوانرۆیی و کڵاشی و گوندی مزران . لە باشووریش ناوچەکەیان دەکەوێتە سنووری شاری دەربەندیخان وهەڵەبجە لە پارێزگای سلێمانی ولەگەڵ هۆزەکانی شەمێرانی و باوایی و شەرەفبەیانی و نەورۆڵی و هارونی هاوسنوورن. شایانی باسە شاعیری بەناوبانگی کورد مەولەوی لەم هۆزەیە، و گۆڕەکەی لە گوندی سەرشاتەیە لە ناوچەکەیان لە باشووریکوردستان. هۆزی تاوگۆزی خاوەنی نزیکەی ٣١ گوندە، نزیکەی ٢٠ گوند لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ١١ گوندیش لە باشووری کوردستان، ئەمەش ناوی گوندەکان: لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان: ١- ملەڕەش ٢- قەڵاجێ ٣- دۆڵی گوێزی ٤- لاپیرسا ٥- بڕی مەلا عەلی ٦- دۆڵەتا ٧- بانی لوان ئەو حەوت گوندەی سەرەوە دەکەونە دەڤەری: «تاوگۆزی تاوگۆز». ٨- بەشی ناوخاس ٩- ئالیخانی ١٠- هۆزی ستە ١١- هەماجگە «ئاوایی بەشی حەمەجان». ١٢- ملەکەوە ١٣- پوینە «ئاوایی دەسێردی لە کوێستان». ئەو شەش گوندەی سەرەوەش «لە هەشتەمەوە تا سازەهەم» دەکەونە ناوچەی دۆڵی دەرە. ١٤- گەزەنە «ئاوایی بەشی ئەلیوەیس». ١٥- دڕێمی ١٦- بانینار «ئاوایی بەشی مەحموود». ١٧- ئەشکێ «ئاوایی هۆزی کوێخا». ١٨- بناوەچ «ئاوایی دەسێردی لە گەرمەسێر». ١٩- خازنۆك «ئاوایی ڕەجەوی». ٢٠- شێخ سێڵە «ئاوایی شێخ سێڵە گەورەدێیە، زۆربەی دانیشتووەکانی لە دەسێردی و هۆزی کوێخا و دڕێمی پێك دێن». ئەم حەوت گوندەش «لە چواردەوە تا بیست دەکەونە گەرمەسێر». لە باشووری کوردستان: ٢١- گمە ٢٢- پشتە ٢٣- قەڵپ ٢٤- مۆرتکە ٢٥- بانی بۆڵان ٢٦- زارێن ٢٧- کانی ژەنان ٢٨- سەرشاتەی خواروو ٢٩- سەرشاتەی سەروو ٣٠- پشتقەڵا ٣١- گورگەچیا «ئەم گوندە دەکەوێتە دەڤەری شارەزوور» [١].

مەولەوی هەمیشە لەسەر خزم وعەشیرەتەکەی هاتووەتە دەنگ، وە بۆ ئەوان دڵی لە دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە ئێشاوە، کاتێك کە ماڵی لە «شەمێران» بووە شێخ «عەلی عەبابەیلێ»یی سەرکاری

---

(١) هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا: حەکیم مەلا ساڵح، چاپخانەی منارە-سنە، چ١، ٢٠٠٤ز. ل١٤٣.

«شەمیران» بووە، پاش ماوەیەك بە تەئسیری «موحەممەد پاشای جاف» ئەو شێخە لەسەرکاری لا ئەبرێ و«عوسمانی خاڵە» لە شوێنی دائەنرێ کە یەکێك بووە لە پیاو ماقوڵانی «یەزدان بەخشی»، ئەم ئاڵ وگۆڕە لەگەڵ وەزعی مەولەوی نەگونجاوە، لەبەر ئەوە مەولەوی لە «شەمیران» باری کردووە وچوەتەوە بۆ «سەرشاتە» لە «تاوگۆز»، کە «محەمەد پاشا» بەمە ئەزانێ نامەیەکی بۆ ئەنوسێ وگلەیی لێ ئەکا تیایا کە بۆچی شەمیرانی بەجێ هێشتووە؟ ئەمیش لە وەڵامی نامەکەی دا بۆی ئەنوسێت کە «عوسمانی خاڵە» لەگەڵ خزمەکانی ئەم باش نەبووە، لەبەر ئەوە ناچار بووە بار بکا، لەگەڵ نامەکە ئەم چەند شیعرە فارسی یەشی بۆ ئەنوسێ:

| | |
|---|---|
| وزان سوی وطن هجرت نمودم | خلافت از علی دانسته بودم |
| به تاثیر محمد میر اکمل | خلافت چون به عثمان شد محول |
| دل خویشان ما را پر ز خون کرد | به خویشاوند خود نعمت فزون کرد |

واتە: بۆیە گواستمەوە بۆ نیشتمان چونکە خەلیفەییم بۆ عەلی بە حەق ئەزانی، وەك بە تەئسیری «محەممەد پاشا»، درا بە «عوسمان» دڵی خزمەکانی ئێمەی پڕ کرد لە خوێن، وەخەلافەت و بەرائەتی بۆ خزمەکانی خۆیی زیادکرد، مەبەست لە عەلی شێخ «عەلی» وە لە عوسمان «عوسمانی خاڵەیە»، مەولەوی لەم شیعرە ناسکانەی دا ئیشارەتی بۆ مەسەلەی خەلافەتی «عوسمان»ی کوڕی «غەففان» و«عەلی»ی کوڕی «ئەبو تالب»یش کردووە، وە ئەو وەزعە ڕابردووەی هێناوەتە بەرچاو[1].

غولام شاخانی ئەردەلان داوای لێ کردووە بچێ بۆ ناوچەی سنە ولەوێ بمێنێتەوە، ودێی زەلان وەربگرێ بۆ خۆی، بەلام مەولەوی هەر ئەوەی پێ باش بووە هەرچۆن بووە لە سەرشاتە کرێنەکەی خۆی بمێنێتەوە[2].

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٢١-٢٢.
(٢) یادی مەردان: مەلا عبدالکریمی مدریس، (ب٢/ل٣٧٧-٣٧٨).

## باسی چوارەم: خێزان ونەوەکانی مەولەوی

مەولەوی یەك ژنی هێناوە وئەو ژنەیش «عەنبەر خاتوون»ی خوشکی ئەکرم ناوی ئەفغانی بووە، کە یەکێك بووە لە وچەند ئەفغانییەی لەو زەمەنەدا سەد ماڵێ لەئەفغانستانەوە هاتوونەتە شارەزوور لە ولاّتی خۆیان کۆچیان کردووە بۆ کوردستانی بابان ولەپەنای پاشای باباندا خۆیان گرتووە(١).

«ئەکرەم خان» لەناو ئەو ئەفغانییانەدا کە هاتوونەتە کوردستان لە هەموویان دیارتر بووە، «عەنبەر خاتوون»ی خوشکی ئافرەتێکی شۆخ وهەڵکەوتوو بووە، «عەبدوڵلاّ پاشا»ی بابان بەوەی زانیوە، ویستوویەتی «عەنبەرخاتوون» بۆ خۆی بخوازێ، بۆ ئەم مەبەستە مەولەوی ناردووە بۆ لای «ئەکرەم خان» بۆ خوازبێنی.

کە مەولەوی دەچێتە لای ئەکرەم خان و باسەکەی بۆ باس دەکات، «ئەکرەم خان» دەڵێ من ژن نادەم بە «عەبدوڵلاّ پاشا» وبڕوام نەدەکرد «مەولەوی» تۆ بۆ داوای وا بێیت بۆ لای من، مەولەوی دەڵێ: ئەی بەکێی دەدەیت؟ ئەکرەم خان دەڵێ: ئەگەر بۆ خۆت بهاتایەیت ئەوا عەنبەرخانم دەدایتێ.

مەولەوی دەگەڕێتەوە بۆ لای «عەبدوڵلاّ پاشا» وباسەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، «عەبدوڵلاّ پاشا» تووڕە دەبێت و سوێند دەخوات کە نەهێڵێت «عەنبەرخاتوون» شووبکات بە کەس، مەولەوی دەڵێ: بە منیش؟! «عەبدوڵلاّ پاشا» دەڵێ: بۆ تۆ دەسەلاّتم نییە و ئەگەر بیدەن بە تۆ، خۆیشم بەرگی بۆ دەکەم، بەم شێوەیە مەولەوی دەبێ بە هاوسەری عەنبەرخانم(٢).

مەولەوی پێش مارەکردنی «عەنبەر خاتوون»ی خێزانی، چووە بۆ ماڵی باوکی تا چاوی پێ بکەوێ بزانێ ئاخۆ دڵی ئەی گرێ یا خود نا، لەوێ داوای ئاو ودۆیەك ئەکا لە «عەنبەر خان» تا بەو بیانووەوە بیبینێ، «عەنبەر خان» کە ئاو ودۆکەی ئەداتە دەستی پێی ئەڵێ «فەرموو خاڵۆ»، مەولەویش ئەم خاڵۆیەیی لەبەر دڵ گران ئەبێت، و ئەمیش بەو موناسەبەتەوە ئەم دوو شیعرە ئەڵێ:

---

(١) پیرەمێرد وپێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان وبەرهەمەکانی: ئومێد ئاشنا، (ب١/ل ٤٥).

(٢) دیوانی مەولەوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، دەزگای ئارا-سلێمانی، چ١، ٢٠١٥ز، (ب١/ل ١١٣-١١٤).

خـالـۆ خـالـۆتـەن، کـەم واچە خالۆ
خـالـۆ دەم وە بـان خـالآنــت مـالۆ
شەرت بۆ من جە داخ خالۆ خالۆی تۆ
وێم کەروو وە کورِ چواردە ساڵەی نۆ

واتە: خالۆ خالۆی چیتە، بەس بڵێ خالۆ، یاخوا خالۆ دەمی بماڵێ بەسەر خاڵەکانتا، شەرت بێ لە داخی خالۆ خالۆی تۆ، خۆم بکەمەوە بە کورِێکی تازەی چواردە ساڵان[1].

مەولەوی بە تەنها شیعرێك یارەکەی ئەلاوێنێتەوە کە ئەمە مەگەر هەر لە دەست ئەو هاتبێ، ئەڵێ:

قـازان قـەتاران قولنگان حەوایی
حەیفەن باڵاکەت شەو وە تەنیایی

یاری ئەزیزی کۆچی ماڵاوایی ئەکا ئەمیش هەم ئەیلاوێنێتەوە، هەم ئەو کارەساتە ئەگێڕێتەوە، ئەڵێ: لەلایەکەوە مەنجەڵەکان ڕیز کراون، ئاویان تیایانا گەرم کردووە بۆ شۆردنەکەت، لەلایەکی کەوە گۆڕ هەڵکەنەکان قولنگە وپاچەکانیان هەموو بەرز ئەکەنەوە وئەیدەنەوە بە زەویدا بۆ هەڵکەندنی گۆڕەکەت، ئاخ حەیفە ئەو باڵاتە شەو بە تەنیا لە گۆڕەکەدا بمێنێتەوە، ئەوە بۆچ لەگەڵت نەبووم؟![2].

مامۆستا عەلائەدین سەجادی لای وایە کەس وکار وخزمەکانی عەنبەر خاتوونی خێزانی کە لە ولاتی ئەفغانەوە هاتوون لەقەبی «مەولەوی»یان داوەتێ[3]، مەولەوی بەواتای مەلا دێت، چونکە تا ئێستەش ئەفغانییەکان لەبری «مەلا» وشەی «مەولەوی» بەکار دێنن، چونکە لەو کاتەدا مەولەوی لەتەرزی گەنجی ژیانیا بووە ودەروێشی وخواناسی وعیلمی ئەدرەوشییەوە ومەلا بووە لە «چرۆستانە» وئەوکاتەش ئەفغانییەکان بەهۆی شەڕەوە سەری خۆیان هەڵدەگرن و دوا هەواریان لە گوندی

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل ٢٣٦.
(٢) مێژووی ئەدەبی کوردی: عەلائەددین سەجادی، ل ٢٩٦.
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٩.

«چرۆستانە» هەڵدەدەن و جێگیر دەبن، مەولەویش تێکەڵیان دەبێت و عەنبەرخاتوون مارە دەکات، بۆیە دەنگوئجێت ئەوان ئەو نازناوەیان داوە بە «مەولەوی»[1].

مەولەوی لە ڕووی شکاندنی نەفسەوە نازناوی «مەعدوم»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، خۆی بە نەبوو داناوە، بەلاّم وشە ونازناوی «مەولەوی» هەندێك دەڵێن لەسەردەمی فەقێیەتی مەولەوی لەشاری سنەی پایتەختی ئەردەلاّن لەلایەن «غولاّم شاخان»ی والی ئەردەلاّنەوە بڕا بەسەریدا لە کۆڕێك لە زانایانی شاری سنە پێك دێنێت لەو کۆڕەدا بەهۆی پلەی بەرزی شاعیرێتی مەولەوییەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مەولەوی لەسەردەمی گەنجی و فەقێتیدا هەڵکەوتوو دیار وپایە وپلەی کۆمەلاّیەتیی وشاعیرێتی بەرز بووە[2].

مەولەوی تەمەنێکی باش و خۆش وپڕخۆشەویستیی لەگەڵ عەنبەر خاتوون بەسەر بردووە، ئەمەش بەوەدا دەرئەکەوێ کە بەمردنی «عەنبەر خاتوون» دنیا لە پێش چاوی مەولەویدا تاریك بووە، وگەلێ پارچە شیعری ناسکی پڕ سۆزی لە لاواندنەوەیا وتووە کە بەرزترین نمونەی شیعری خۆشەویستی ولاواندنەوەن لە ئەدەبی کوردیدا.

مەولەوی لە عەنبەر خاتوون چەند کوڕ وکچی بووە، کوڕەکانی ئەمانەن:

١. سەیید محەمەد: کە گەورە بووە وژنی هێناوە، بەلاّم لە ژیانی مەولەوی خۆیدا، بە گەنجی مردووە ولە دێی گونە بە خاك سپێردراوە.

ئەگێڕنەوە لە کاتی نەخۆشی مردنی ئەم کوڕەی مەولەویدا باوکی لە تەوێڵە بووە لای «شێخ سیراجوددین»، ئەنێرن بەدوایا بگەڕێتەوە، کە دێتەوە لەپشت دێی «عەنەب»ەوە دەست ئەکا بەگریان، لێی ئەپرسن بۆچی ئەگری؟ ئەویش ئەڵێ چۆن نەگریم! حەزرەتی «یەعقووب» بۆنی کراسەکەی «یوسف»ی کوڕی بە لووتا هات پێی شادمان بوو، من بۆنی کفنی «موحەممەد»ی کوڕم دێتە لووت ودڵم ئەبرژێ! کە ئەگاتە ماڵ ئەبینێ «موحەممەد»ی کوڕی مردووە و شۆراوە وپێچراوە لە کفنەکەی وچاوەڕوانی گەڕانەوەی باوکینی، ئەم «سەیید موحەممەد»ە کوڕێکی بووە کە ناوی «موحەممەد سەعید» بووە ووەچەی لێ کەوتووەتەوە.

---

(١) مەولەوی وتەقینەوەی زمان: حەکیم مەلا ساڵح، دەزگای ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠٨ز، ل ٧١.

(٢) دیوانی مەولەوی لەهەورامی بۆ سۆرانی: محەممەد ئەمینی ئەردەلاّنی، بلاّوکراوەی ئیحسان-تاران، چ١، ٢٠٠٩ز، ل٢٨.

**٢. شێخ موحەممەد کە ئەمیش گەورە بووە وژنی هێناوە، بەڵام بە گەنجی مردووە وکوڕێکی لێ بەجێ ماوە کە ناوی عەلی بووە، ئەمیش هەروا وەچەی لێ کەوتووەتەوە.**

**٣. سەیید عەبدوڵلاً کە زۆر ژیاوە و چەند ژنی هێناوە وگەلێ وەچەی لێ کەوتووەتەوە.**

**٤. هیدایت کە بە گەنجی بەر لە ژن هێنان مردووە. شێخ بەهائوددین بە بۆنەی مردنی ئەم کوڕەوە چووە بۆ دڵدانەوەی مەولەوی وسەرخۆشی لێ کردنی، مەولەوی بەم هاتنەی شێخ ئەوەندە شادمان بووە وتوویە خۆزگە چەند کوڕم ئەبوو یەك لە پاش یەك ئەمردن بە مەرجێ تۆ بۆ پرسەی هەر کامیان بەم جۆرە ئەهاتی بۆ لام.**

**نەوەی مەولەوی هەموو ئینسانی ڕەوشت بەرز وبەشەرەف بوون وتێکەڵییان لەگەڵ بنەماڵەی شێخ سیراجوددین بووە وهاتوچۆی شێخ ضیائوددینیشیان کردووە، تەنانەت ئەوەندە لەگەڵ ماڵی شێخ تێکەڵ بوون هەرچەند هاتوونەتە بیارە ئەوەندە خۆیی بوون وئەوەندە ماونەتەوە، زۆر کەسی نەشارەزا وایان زانیوە کوڕانی شێخن لە دەرەوە هاتوونەتەوە، بۆ ماڵی باوکیان، ئەمانە زۆر بەقەناعەت وبوردەباری لەدێهاتی عەشرەتی خۆیانا، وەك «مۆرتکە» و«زارێن» و«سەرشاتە» ژیاون، لەگەڵ ئەوەش هەمیشە میوانیان بووە وخەڵك لایان داوەتە لایان وماڵیان وەك کاروانسەرا بووە بۆ ڕێبوارانی ئەو ناوچەیە[١].**

**ئێستا نەوەکانی لە ناحیەیی «زەڕایەن-وارماوا» لە ناوچەی شارەزوور دادەنیشن[٢].**

---

**(١) یادی مەردان: مەلا عبدالکریمی مدریس، (ب٢/ل٣٧٩).**

**(٢) دیوانی مەولەوی لەهەورامی بۆ سۆرانی: محەممەد ئەمینی ئەردەڵانی، ل٨.**

## باسی پێنجەم: چەند سەرگوزەشتەیەك لە ژیانی مەولەوی

مەولەوی ومەحوی، ناو وناوبانگی یەکتریان بیستبوو، بەلاّم یەکتریان نەدیبوو، هەردووکیشیان تامەزرۆی بینینی یەکتری بوون. جارێك مەولەوی ڕێی ئەکەوێتە سلێمانی ،دەمەو ئێوارەیەك ڕووئەکاتە خانەقای مەحوی. لەکاتەدا مەحوی یش لەسەر سەکۆی مزگەوت دانیشتووە وچاوەڕوانی بانگی ئێوارەیە. ئەبینیێ پیاوێکی میانە بالاّی ڕیش تەنکی چاوگەش ودرێژکۆلە بەخەرقەیەکی سەوزی ئاودامانەوە ومێزەرەیەکی گوڵداری لەقوماشی چیت دروستکراو بەسەرەوە . . .خۆی کرد بە مزگەوتا وڕووی کردە گویێ حەوزەکە وخەرقەکەی داکەندو دەستی کرد بەدەست نوێژگرتن.مەحوی زۆر سەرنجی ئەم پیاوە ئەدات و لەوەوپێشیش وەصفی مەولەوی یان بۆکردووە. دێت بەدڵیدا وئەڵێ ئەمە مەولەوی نەبێت؟ مەحوی یەکێك ڕادەسپێرێ ،ئەڵێ بچۆ بەو پیاوە بڵێ ئەوە چی یە بەسەرتەوە؟!کاتێك ئەو کەسە دێت بەمەولەوی دەڵێت" ئەوە چی یە بەسەرتەوە؟!" مەولەوی لەوەلاّمدا ئەڵێت: کوڕم ئەوە چیتـــە بەسەرمەوە؟ مەحوی کە گوێی لەم وەلاّمە نەستەقە ئەبێت «چیتـــە بەسەرمەوە» ،لەلایەك مانای هەقت چی یە بەسەرمەوە و،لەلایەکی تریشەوە مانای: قوماشی چیتە بەسەرمەوە، لەسەر سەکۆکەوە بانگ ئەکات خالّە مەولەوی! مەولەویش لەوەلاّمدا دەڵێ مەحوی گیان! دواتر مەحوی ڕادەکاتە خوارێ باوەش بەیەکدا دەکەن ومیوانی ئازیز وخانەخوێی خۆشەویست چەند ڕۆژێکی پڕ لەڕازی ئەدەبی پێکەوە ئەبەنە سەر(١).

سەید حەسەنی موفتی لە سلێمانی ئەیەوێ ژنێکی تر بهێنیت. لە دواییا «حەبەخان»ی کچی شێخ عەلی عەبابەیلەی بۆ ئەدۆزنەوە وڕێ ئەکەون، کۆمەڵی سوار لە سلێمانییەوە ئەچن بۆ گواستنەوەی حەبەخان، لەو لاوە سوارەی عەبابەیلەش لەگەڵ بووکا دێن بۆ سلێمانی، شێخ عەلیش پیاوێکی ناودار ولەگەڵ مەولەوی دا زۆر دۆست بوون، مەولەویش لەبەر ئەو دۆستایەتیە کە هەبوو وبۆ ئیحترامی شێخ عەلی لەگەڵ حەبەخانا دێت بۆ سلێمانی.

---

(١) میهرەجانی مەولەوی: چاپخانەی زەمان-بەغداد، ١٩٨٩ز، ل ١٦٨-١٦٩.

لە ڕێگادا «حەسەنی ئامێ» هەبوو گۆیندە و دەنگ خۆشی ناو ئەو دەستە سوارە ئەبێ، بەڵکو گۆیندەی ئەو دەورەش بوو، ڕووی لێ ئەنێن بۆ وتن، ئەویش بە مەقامی «ئای ئای» دەس ئەکا بە خوێندنی شیعری مەولەوی کە ئەو سەردەمە بە شیعری مەلاڕەحیمی ناوی دەرکردبوو.

هەر حەسەنی ئامێ دەست ئەکا بە وتن مەولەوی لەسەر ولاغەکەوە حاڵی لێ دێ و وەکوو بارانی بەهار ئاو بەچاویا دێتە خوارەوە! خەڵکەکە ئەمەیان پێ ناخۆش ئەبێ، چونکە ئەوان بۆ شایی هاتوون، کەچی ئێستە شایی بوو بە شین وگریان، ئەچن بەحەسەن ئەڵێن: بابە! ئیتر مەیلێ با لەمە زیاتر گریانی مەولەوی شاییەکە نەکا بە شیوەن، حەسەن بێ دەنگ ئەبێ و بەلاّم پێشی ناخۆش ئەبێ، کەوا گۆیندەیەکی وەکوو ئەو بۆ شتێکی وا بێ دەنگ بکرێ، ئەچێتە بن دەستی مەولەوییەوە وپێی ئەڵێ: "بەقوربانت بم! من شیعری تۆ ئەخوێنمەوە تۆ بۆچ وا ئەگری؟"، مەولەویش ئەڵێ: "بەقوربانت بم! من کەی وا خۆشم وتووە"[(١)].

مەولەوی چاوەکانی کوێر بوبوون، لەپاش ماوەیەك مەلا موسایەکی پاوەیی هەبوو ئەچێ بۆ لای و دەست ئەکا بە دڵدانەوەی مەولەوی وئەڵێ: "هیچ پێی سەغڵەت مەبە ئەگەر بزانی سەواب وجەزای بێ چاوی چەندە، زۆر خۆزگەت ئەخواست بۆ ئەوە کە خوا هەر دوو دەست وقاچیشت گۆج بکا وتووشی ملەخڕەش ببی!".

مەولەویش ئەڵێ: "مەلا موسا ئەگەر بە هیچا نەزانم جەزای چاو نەبوون چەند زۆرە، بەوەدا ئەیزانم کە تۆی پێ نابینم"![(٢)].

جارێکیان میوانی دۆستێکی ئەبێ لە پاوە، تا لەوێ ئەبێ خواردنێکی خۆشی دەرخوارد نادا.کە ماڵئاوایی لێ ئەکا و ئەگەڕێتەوە دۆستەکەی تا ملەی کەڵیان-کە شوێنێکە لە نزیکی پاوە-ڕەوانەی ئەکا.لەویا پێی ئەڵێ:بێ قەزابی پەلەت کرد و زوو تەشریفت برد...من بە تایبەتی کاوڕێکم هەڵ گرتبوو ئەمشەو بۆتی سەڕبرم و بیکەین بە کەباب و پێکەوە بیخۆین و رای بوێرین... مەولەویش لە

(١) ڕشتەی مرواری: عەلائەددین سەجادی، ٢٠١٠ز-١٣٨٨ك، (ب٥/ل٥٣٩).

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، (ب٥/ل٤٣٢).

وەلاَمدا ئەڵێ: مادەم وابێ وەالله دڵت نایەشێنم ولەگەڵت ئەگەڕێمەوە تا کەبابەکە بخۆین... وە ئەگەڕێتەوە.کابراش ناچار کاوڕەکە سەرئەبڕێ و بۆی ئەبرژێنێ[1].

مەولەوی لە ۱۲۷۱ی کۆچیدا بە فەرمانی شێخی ((سراج الدین)) لەگەڵ حاجی شێخ ((عبدالرحمن))ی کوڕی شێخا ئەڕوا بۆ ((سنە)) بۆلای ((غولاَم شاخانی والی)) بۆ مەسەلەیەکی ئایینی. پاش ئەوەی چاویان بە والی ئەکەوێ، ڕۆژێکیان والی بە مەولەوی ئەڵێ: حەز ئەکەم بۆم بەیان بفەرمووی لەگەڵ بوونی ((امیر المؤمنین علی)) دا چۆن قابیلە بێگانە ببێ بە خەلیفە وجێگە نشینی پێغەمبەر؟ ((میرزا جەعفەرخانی وەزیر)) وە مامەیەکی ((والی))یش کە قلیانداری خۆی بووە لەو مەجلیسەدا ئەبن، مەولەویش لە وەلاَمدا بە والی ئەڵێ: ڕجا ئەکەم لەبەر خاتری ڕیشی سپی مامت ئەم پرسیارە لەجەنابی وەزیر بفەرمووی، والی تێ ئەگا مەولەوی مەبەستی چیە و!... سەر دائەخا، مەبەستی مەولەوی ئەوە بووە: ئەگەر خزمایەتی بوایە بەهۆی نزیکی وبەڵگەی جێ نشینی، نە ئەبوو والی مامی خۆی بکا بە قلیاندار وبێگانە بکا بە وەزیر... هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە ئەگەر خەلافەت بەسرابوایە بە خزمایەتی یەوە خۆ حەزرەتی عەباس مامی پێغەمبەر بووە، وە حەزرەتی عەلی ئامۆزای بووە، کەواتە ئەبوو والی داوای خەلافەتی بۆ عەباس بکردایە نەك بۆ عەلی[2].

مەولەوی جارێکیان لەگەڵ زانایەکی جەعفەری گفتگۆ ئەکا، زاناکە لێی ئەپرسێ بۆچی ئەهلی سوننەت بەرامبەر بە حەزرەتی عەلی چاو لە ڕاستی ئەنوقێنن وحەقی خۆی نادەنە دەست ودان بەوەدا نانێن کە خەلیفەی یەکەم بووە، بەڵکو خۆشیشتان ناوێ؟ مەولەوی لە وەلاَمدا ئەڵێ: سوننی یەکان لایان وایە عەلی ناوی دوو کەسن، یەکەمیان کابرایەك بووە لەترسی خەڵك فەرموودەی پێغەمبەری خستوەتە پشت گوێی کە لەبارەی خەلیفەیی ئەوەوە فەرموویەتی، وە دەستی لە حەقی خەلافەت هەڵگرتووە بۆ یەکێکی بێگانەی ناشایان، وە گوێی بە شەرع نەداوە و«جاریە»ی لە خەلیفەیەکی «غصب»کەر وەرگرتووە وکچی خۆیشی داوە بە خەلیفەیەکی تری «غصب»کە.. ئێمە ئەو عەلی یەمان خۆش ناوێ، دووهەمیشیان کەسێکی خاوەن باوەڕ وئازا ولە ڕێ لانەدەر بووە، وە لە خوا بەولاوە لەکەس نەترساوە و«جاریە»ی لە خەلیفەی شەرعی نەبێ لەکەسی تر وەرنەگرتووە وکچی خۆی بە خەلیفەی

---

(۱) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل ۲۳.

(۲) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ۲٦.

پێغەمبەر داوە وبەجێگەداری ڕاستی ئەوی زانیوە، ئەو عەلی یەمان خۆش ئەویٚ وبەشێری خوا وخۆشەویستی پێغەمبەر ودرگای شاری زانستی ئەزانین، مەبەستی مەولەوی ئەوە بووە: ئەگەر حەزرەتی عەلی خۆی بەخەلیفە بزانیایە ولای وابوایە پێغەمبەر بڕیاری داوە ئەو خەلیفە بێ، دەستی لەو خەلافەتە هەڵنەئەگرت، وە «جاریە»ی وەرنەئەگرت لە حەزرەتی ئەبووبەکر وکچی خۆی نەئەدا بە حەزرەتی عومەر[(١)].

پاش تەواو بوونی ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنی مەولەوی لە خزمەتی مەلا «عەبدورڕەحمانی نۆدشە»بیدا کە موفتی سلێمانی ومامۆستای مزگەوتی «مەڵکەندی» بووە، ئەحمەد پاشای بابان وپاشازادەکانی تر وتاقمێك لە مەلا وفەقێ ئەچن بۆ سەرچنار بۆ سەیران، لەڕێگەدا فەلاحێك سەر ڕێگایان لێ ئەگرێ ودەس ئەکا بەسکالای حاڵی خۆیی لای «ئەحمەد پاشا» وپێی ئەڵێ: پارچە بەراوێکم هەیە هەموو ساڵێ ئەیکەم بە تەڕەکاڵ وبۆ خۆم پێی ئەژیم، ئەمساڵ یەکێك لە پیاوەکانی تۆ لێی داگیرکردووم وزۆریشم لێ ئەکات بە جووتی خۆم بیکێڵم وبیکەم بە تەڕەکاڵ بۆ ماڵی پاشا. مەولەوی نایەڵی پاشا وەڵامی فەلاحەکە بداتەوە، ئەچێتە پێشەوە وخۆی لە فەلاحەکە توورە ئەکا، کابرای فەلاح سەرسام ئەبێ و بەمەولەوی ئەڵێ: مەلا تۆ لای خۆت مەلایت وپیاوی دینی، کە تکایەکم بۆ ناکەیت وچاکەت لە دەم دەرناچێت بۆچی خراپەم لەگەڵ ئەکەی؟ مەولەویش ئەڵێ: مردوت مرێ من لەبەر بێ ئەعەقلی تۆ توورە بووم، ئاخر تۆ نەت بیستووە دنیا مەزرەعەی ئاخیرەتە، ئێستا پاشا ئەگەر بە جووتی بێگاری زەوی داگیرکراو نەکێڵێ ونەیکا بە تەڕەکاڵ بۆ دیوەخان، «دنیا»ی چۆن ئەبێ بە مەزرعەی قیامەتی؟ کە پاشا ئەم قسەیەی مەولەوی ئەبیسێ شەرمەزار ئەبێ وئەڵێ: مەولەوی تکا ئەکەم بەسیەتی، کابرا تۆ بڕۆ زەوی خۆت بۆ خۆت وهەر پیاوێکی من هات بەلاتا دەریکە وگوێی مەدەرێ[(٢)].

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل ٢٧.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥-٢٦.

ئەگێڕنەوە کە جارێك مەولەوی ئافرەتێکی زۆر جوان ئەبینێت ولەوکاتەشدا پرسیاری نەحو و صرفەکەی لیٚ دەکەن، ئەویش بەم شیعرە وەڵامی ئەیاتەوە و دەڵێت:-

تـا دڵ وە تـەمـای ئـەو تـرفـە تـرفەن

نحوم هەر مەحوەن صرفم بیٚ سەرفەن

واتە:- تا دڵ بەتەمای شەوق و بریسکەی ڕووخساری یار بیٚ، نە کەڵك لە خوێندنی عیلمی نەحو وەرئەگرم چونکە نەحوەکەم مەحو بووەتەوە واتە سڕاوەتەوە و وە نە کەڵکیش لە عیلمی صرف وەرئەگرم چونکە صەرفەکەشم سەرف بووە و هیچ قازانجی نەماوە[1].

مەولەوی جارێك لەگەڵ ((قەمەر)) ناوێکا ئەکەوێتە مشتومڕ لەسەر نوێژ، مەولەوی پێی ئەڵیٚ بۆچی نوێژ ناکەی؟ ئەویش ئەڵیٚ لەدەفتەری عیلمی خوادا تێپەڕیوە کە من نوێژ ناکەم، خواست وزانراوی خوایش نابیٚ پێچەوانەی یەك بن، کەواتە خوا خۆی نایەویٚ من نوێژ بکەم، مەولەویش لە وەڵامی ئەمەدا ئەم شیعرە ئەڵیٚ:-

دەفتەری لــەوحی قەزات لـە بەرە

خەفەتت جەهلی خاوەن دەفتەرە

واتە:- دەفتەری لەوحی قەزا وقەدەری خوات لەبەرە ئەزانی تیا نووسراوە نوێژ ناکەی!، وە ئەترسیٚ ئەگەر نوێژ بکەی خوا بە نەزان دەرچیٚ؟![2]. مەولەوی لێرەدا مەبەستی ئەوەیە بیانوویەکی هیچ وپووچ وبیٚ جێیە...

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل ١٦٨-١٦٩.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٩.

# باسی شەشەم: بەرهەمەکانی مەولەوی و یەکێك لەشاکارەکانی

## أ) بەرهەمەکانی:

مەولەوی پایەیەکی بەرزی هەیە لەناو زاناکانی کورددا، وە بەتایبەتی لە زانستی «کەلام»دا دەستێکی بالأی هەبووە، ئەو دانراوانەی کە لەپاشی ماونەتەوە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. «الفضیلة»: لە «٢٠٣١» شیعری عەرەبییە ولە«١٢٨٥ك» ی دایناوە وعەنتیکەیەکی هونەرییە جگە لەوە کەمەعنا عیلمییەکەی زۆر ورد و بەرزە، یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

بسم الله الرحمن الرحيم          من تاه فيه نهية الحكيم

واتە: بەناوی ئەو خوایە کە بەخشندە ومیهرەبانە، ئەو خوایەیی کە عەقڵ وژیری دانایان سەریان سورماوە وتیاماون لە ئاست ناسینی خوای گەورەدا.

ئەم کتێبە کتێبێکی زۆر بایەخدارە وشاکارێکە بەزمانی عەرەبی ونمونەیەکی نەبینراوە، مەولەوی بەفەرمانی «شێخ موحەممەد بەهائوددین» دایناوە ولەسەردەمی ژیانی خۆیدا زۆر خوێنراوە، مامۆستا «عەبدولکەریمی مودەڕڕیس» شەرحێکی باشی لەسەر کردووە بەناوی «الوسيلة في شرح الفضيلة»[1].

ئەمەش یەکێکە لە هۆنراوە پڕ ماناکانی مەولەوی کە باسی زاتی خوای گەورەی تێدا دەکات ودەڵێ:

لا صبح لا يوم لديه، لا مسا
ولم يكن حين فِناه لامسا
و كان، آن كانَ، (كان) ليساً
ثوى بحيثُ ليس (حيثُ) أيسا
متى (متى) حتى اتى عليه؟
من اينَ (اين) ينتمي اليه؟
هل ساعد يصله في كم (كم)
وكيف لا كيفٌ مع الكيفِ يضم؟[2]

---

(١) یادی مەردان: مەلا عبدالكريمی مدريس، (ب٢/ل٣٦٨-٣٦٩)، ودیوانی مەولەوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، (ب١/ل ١٥١).

(٢) الوسيلة في شرح الفضيلة: عبدالكريم محمد المدرس، مطبعة الارشاد-بەغداد، چ١، ١٣٩٢ك-١٩٧٢ز، ل١٥-١٦.

٢. «العقيدة المرضية»: كە «٢٤٥٤» شیعری کوردییە و لە«١٣٥٢ك»ی لەلایەن «محي‌الدين صبري النعيمي»یەوە لە میسر لەچاپ دراوە، یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

زوبدەی عەقیدە و خولاصەی کەلام　　　　هەر لە تۆ و بۆ تۆس حەمد و سەنای تام

مەولەوی خۆی ئەم عەقیدەیەی کورت کردووەتەوە وباسە گرانەکانی لێ لابردووە بۆ ئەوەی قوتابییە تازەپێگەیشتووەکانی لێی تێبگەن.

مامۆستا «عەبدولکەریمی مودەڕڕیس» شەرحێکی لەسەر کردوە ومامۆستا «فاتیح»ی کوڕیشی پێداچوونەوەی بۆ کردووە، «بابە علی شێخ عمر قەرەداخی» لێکدانەوە ولێکۆڵینەوەی بۆ هەڵبژاردەیەك لە شیعرەکانی کردووە و ناوی «هەڵبژاردەیەك لە عەقیدەی مەرضەی مەولەوی»یە.

٣. «الفوائح»: كە «٢٥٧» شیعری فارسییە ولەگەڵ عەقیدە کوردییە باسکراوەکەدا لەچاپ دراوە، یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

چو در خود بینم بس رو سیاهی　　　　نگنجد ای الهی یا الهی

٤. «دیوانی مەولەوی»: کە داگری هۆنراوەکانیەتی ولەساڵی١٣٨٠ك»ی لەلایەن مامۆستا «عەبدولکەریمی مودەڕڕیس»ەوە کۆکراوەتەوە ولەچاپ دراوە، شایەنی باسە کە مامۆستا «مودەڕڕیس» گەلێ تێ کۆشاوە کە هۆنراوەکانی مەولەوی کۆبکاتەوە وڕاڤەیان بکاتە سەر زاراوەی کرمانجی باشوور «سۆرانی».

٥. جارێکی تر «دیوانی مەولەوی» کۆکراوەتەوە لەسەر دەستی مامۆستا «محەمەد عەلی قەرەداغی»، لەنێو دوو توێی دووبەرگدا، شیعرەکانی مەولەوی بەسەر چەندین تەوەرەدا دابەشکردووە، ئەو تەوەرانەش بریتین لە «نامەکانی مەولەوی، شیوەن، بەهارییە ووەرزەکان، سکاڵا ودەردە دڵ، ئاینی، دڵداری، فۆلکلۆر، ساقی نامە، قەتارییە»[١].

٦. «دیوانی مەولەوی»: لەلایەن مامۆستا «محەمەد ئەمین ئەردەڵانی»یەوە کراوە بە سۆرانی بە شێوەی هۆنراوە، لەلایەکەوە هۆنراوەکەی هێناوە بە شێوەزاری گۆرانی ولەلایەکەی ترەوە بە شێوەزاری سۆرانی هێناویەتی بەم شێوەیەی خوارەوەدا:

---

(١) دیوانی مەولەوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، (ب١/ل١٧٣).

| (سۆرانی) | (هەورامی) |
| --- | --- |
| لە بێ کەسی خۆم من تۆم کرد بەکەس | جەبێ کەسی وێم تۆم کەردەن وەکەس |
| نە بەکەس شیای نە بە نیوە کەس | نەوەکەس شیای نەونیمە کەس |
| دڵەکەم بۆ تۆ مەیلی بێ شۆیە | سەر جەڕاستی کەردەنم توفەیل |
| من مەجنوونی تۆ، لەیلم هەر تۆیە[1] | من مەجنوون تۆم تۆم کەردەن وە لەیل |

٧. «دیوانی مەولەوی»: «پیرەمێرد»ی شاعیریش هەندێ لە هۆنراوەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی سۆرانی، وناوی ناوە «ڕۆحی مەولەوی»، هەروەك خۆی لەبارەی «ڕۆحی مەولەوی»یەوە، دەڵێت: "خوا ئەیزانێ وئەهلی مەعنا باوەڕ دەکەن کە «ڕۆحی مەولەوی» وەك مثنوی مەولەوی، ڕۆح نەواز ودڵ پەسەندە، تا ئێستا لەپەردەی زوبانی هەوراماندا بوو، وا دەرکەوت"[2]، یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

ئەی بۆ مەوجودات تۆ بووی بە مایە
تەنها تۆ پەیدا وماسوا سایە
پەنهان بووی، وەحدەت شەپۆلێکی دا
بۆ ناسینی خەڵك خۆت، خۆت کرد پەیدا[3]

٨. «شەریعەتی مەیل»: کە «همایۆن صاحب» ڕاڤە وشکاری بۆ هۆنراوەکانی مەولەوی ئەکات، لە توێی«٦٥١» لاپەڕەدا، ئەم کتێبە بە شێوەیەکی ورد بە پێی حەرفی ئەبجەدی شیکاری بۆ هۆنراوەکانی مەولەوی دەکات.

٩. «خاطیراتی مەولەوی»: کە گوایە ئەم کتێبە گەلێ شتی بەسوودی لەبارەی مەولەوییەوە تیابوو، بەڵام هیچ ئاسەوارێکی نەماوە ودیار نیە.

---

(١) دیوانی مەولەوی لەهەورامی بۆ سۆرانی: محەمەد ئەمینی ئەردەڵانی، ل٣٠٣.

(٢) ڕۆحی مەولەوی: پیرەمێرد، انتشارات محمدی سقز- سنە، چ٢،١٣٧٣هەتاوی- ١٩٩٣ز، ل١٢٦.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١.

**١٠. «منشآت»: نامە فارسیەکانی مەولەوی،«٢٦» نامەی فارسی مەولەوی تێدایە[١].**

**١١. «توسل نامەء مولوی»: بە «رجال سلسلەی طریقەی قادریە» تا «حضرت کاك أحمد شیخ»، خرایە کۆتایی کتێبی «فوائد الفوائح»ەوە وبلاّوکرایەوە[٢].**

**١٢. «ڕیسالەی عیشق لەمەولەوی ناسیدا»: بریتیە لە لێکۆڵینەوەیەك لە بابەت شاعیرەوە لەگەڵ لێکدانەوەی گوڵچنێك لەشیعرەکانی، لەلایەن سۆرانی سنەی ئامادەکراوە ولەساڵی «١٩٩١ز» لە شاری «ورمیٚ» ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی بلاّوی کردۆتەوە[٣].**

**١٣. «مەولەوی وپەخشانی کوردی»: بریتیە لە لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە پەخشانەکانی مەولەوی، لە ساغکردنەوە ولێکدانەوەی حەکیمی مەلا صالّح، لەساڵی «٢٠١٠ز»، بلاّوکرایەوە.**

**١٤.جگە لەمانەش نامیلکەیەکی بە فارسی هەیە باسی ئوسوولی تەریقەتی نەقشبەندی دەکات[٤].**

---

(١) دیوانی مەولەوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، (ب١/ل١٦٢).

(٢) بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد: محەمەد عەلی قەرداغی، بلاّوکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠٤ز، (ب١/ل٢٣٩).

(٣) مێژووی ئەدەبی کوردی: مارف خەزنەدار، (ب٣/ل٣٥٤).

(٤) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل١٨، بنەماڵەی زانیاران: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٣٩٢، مەولەوی ژیان وبەرهەمی: محمدی مەلا کەریم، ل١٠، مێژووی ناودارانی کورد: بابە شێخ مەردۆخ ڕۆخانی، (ب٢/ل٤٤٦)، مێژووی وێژەی کوردی: سدیق بۆرەکەیی، (ب١/ل٥٤٣-٥٤٤)، مێژووی ئەدەبی کوردی: مارف خەزنەدار، (ب٣/ل٣٥٤-٣٥٥)، مێژووی زانایانی کورد: مەلا تاهیر مەلا عبداللە بەحرکەیی، (ب٢/ل٩٨)، یادی مەردان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، (ب٢/ل٣٦٧).

## ب) یەکێك لەشاکارە ناوازەکانی مەولەوی:

مەولەوی دۆستی زۆری هەبووە و بەردەوام نامەیان گۆڕیوەتەوە وبەشێکی زۆر لەدیوانەکەی بریتیە لەم نامە شیعریانە، لەوانەش نامەیەکی شیعری بۆ حەمە پاشای جاف نوسیوە کە لەبارەی ئیشی کەسێکەوە بۆ مەولەوی ناردووە، ومەولەویش لەگەڵ ئەم هۆنراوەیەدا نامەیەکی بێ نوختەی بۆ دەنێرێت، ئەمەش هۆنراوەکەیە:

مـەیـلـت ئـارەزووی ئـەغـیـار کەردەبێ
چێش خامەکەت نـام مەعـدووم بەردەبێ
بێ مـنـەت جـە مـەیـل ئـامـای نامەتم
مـەمـنوونی جە وەفای ڕەشحەی خامەتم
پەرسابێت چۆنی؟ وێت غەڵەت کەردەن
مـــەر نمـــەزانـی دووریـــت چ دەردەن
گـەرمـیی بـڵێسـەی دەروونـی دەماخ
دێـوەلـوولـی ئـاخ دڵـەی پـڕ جە داخ
ئـەو بەرد نم نە چەم دیدەی پڕ جە دەرد
ئێد مـالا ڕووی حەرف خەیاڵی بێگەرد
نـە قـەتـرەی ئەسرین مەندەن نە چەمدا
نـە نـوخـتـە نە حەرف ئینشای ماتەمدا
عـەرزە شـاهـیـدەن خـاس بدیە پێشدا
حـەرفـی نـوخـتـەدار نەمەندەن تێشدا[(١)]

مەولەوی کاتێك وەڵامی «حەمە پاشای جاف» ئەداتەوە دەڵێت تۆ نەت ویستووە نامەم بۆ بنووسی، بەڵام ئیشی ئەم پیاوە ناچاری کردووی، مانای ئەم هۆنراوەنەش:

واتە: خۆش ویستنی تۆ ئارەزووی بێگانەی کردبوو، کەچی قەڵەمەکەت ناوی هێنابووم.

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٤٤١-٤٤٢.

منەتی ئارەزووی هاتنی نامەت هەڵناگرم چونکە بەهۆی ئیشی خەڵکەوە بووە، بەلاّم مەمنوونی وەفای پرژی قەڵەمەکەتم کە ناومی نووسی.

پرسیارت کردبوو کە چۆنم، بەلاّم تۆ خۆت بەهەڵەدا بردووە، بۆچی نازانی دووریت چۆن دەردێکە تووشم هاتووە؟

گەرمی بڵێسەی ناو دەماخم تەڕایی نەهێشتووە لە چاوە پڕ دەردەکانما، وە گێژەڵووکەی ئاهوو هەناسە هەڵکێشانی دڵەی پڕ داخم ڕووی ئەو حەرفانەی ماڵیوە کە لە خەیاڵی ساف وبێ گەردمان.

لەبەر ئەوە نە دڵۆپەیەك فرمێسك لە چاوما ماوە، وە نە حەرفەکانی نامەکەم کە باسی خەفەتباریم ئەکا نوختەیان پێوەماوە.

نامەکەم شایەتمە، باش سەیری بکە حەرفی نوختەداری تیانەماوە[١].

ئەمەش دەقی نامەکەیە بە زمانی فارسییە:

اول هر کلام کە هموارە اهل کمال در سطور آرد، وأکمل وأصح هر طور أملح وسحر حلال کە کلك درر سلك گهر مرسوم معدوم محروم محرر ومسطور دارد، حمد ومدح هر حامد و هر مادح، در گروە هر مسلم و در رهگ هر ملحد کادح، کرور در کرور، در همە اعصار و دهور، مر درگاە عالم آرامگاە (لا الە إلا الله)را، و درود لا معدود وسلام لامحصور و لامحدود عدد (کل داء و دواء مادام السمك والماء، والسماك والسماء)، مر سالار ملك محدود وسردار محل محمود، و کارگاە در علوم همەء علماء آگاە، (محمد رسول الله)را، و مر آل اعلام و اولاد اطهار الاسرار احرارا، وسائر اهل اسلام وگروە صوالح الاطوارا، حمد الە عالم حاصل، و درود وسلام رسول کامل آمد .

مرسول کالوصول را آمادە، وگرح اهل ودادرا در دل آوردە، کە همراە آە دل مکدر در هر مساء وسحر سرکار مکرم وسردار اکرم واولوالامر مکارم ومراحم همەرا ادام الله عمرە طوعا وروحا مرسل رسائل دعا وسلامم.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤١-٤٤٣.

معلوم سرکار آمده که ولد آدم وحواء ولد دواد آسا اگر همه عالم کالهواء محکوم امر و رام حکم او گردد، در مآل کار کر و کور، ومحل او گور، و همسر او مور گردد. عرعر وسرو عمر همه‌کس صرصر عدم و اره‌ء مرگ در راه دارد، وحاصل محصول دوام هر احدرا داس اعدام ملك مالك الارواح در درو آرد. سرور هر رهرو دل در دارالسلام در گرو راه آورد اعمال صوالح آمد. حالا که همدم روحم ولاء عمل صلحاء در کاردار که (لو راح الروح، وصار آدم کالمکروه والمطروح، لاطمع لعامل السوء الا سوء الدار)، ارحم همه‌ء رحماء واکرم همه‌ء کرماء مرده‌هارا همه در دارالسلام مع السلام همسر سور وسرور و حور وسرکار کرم مدار و اولاد واهل ودادرا کام روا ودائما در آلاء سرمد و روح مدد همم اهل الله محروس ومسلم ومسرور، واعداء اورا در آلام مد ملوم ومدحور دارد. ملول دعا مدلول صعلوك در صدد سلوك راه وصال اعدل الملوك را درد در دل ووصل سرکار اورا روحا مائل آمده رسائل رسائل، اما هوا سرد ودل آلوده‌ء درد و راه دور و کأس آمال مالامال گرد. اصل اصول همه کامها و آسای کل مأمول ومرام (الدعاء لکم ولأولاوکم مادام الروح و وسعه الحال، والسلام والاکرام هو الموصل لکل موصول مدلول مرسول معدوم ملول ومحمح ادراك سرکار آمر مکرم هم اسم محمد مکرم صل اللهم له وسلم مادام العالم... والسلام)[1].

المعدوم

(١) یادی مه‌ردان: مه‌لا عبدالکریمی مدریس، (ب٢/ل٤٦٦-٤٦٧).

# باسی حەوتەم: مامۆستا ومورشیدەکانی مەولەوی

١- «شێخ عوسمانی سیراجەدین» «١١٩٥ك» لە گوندی تەوێڵە لە دایك بووە وساڵی«١٢٨٣ك» لەهەمان شوێندا کۆچی دوایی کردووە وچووەتەوە باوەشی دایکی نیشتمان.

٢- «شێخ محەمەد بەهادین ئەبولبەها» «١٢٩٨ك» کۆچی دوایی کردووە، ئەم پیاوە کوڕ وجێگری «شێخی سیراجەددین» بووە، مەولەوی دوای کۆچی دوایی «شێخی سیراجەددین»، لەسەر دەستی «شێخی بەهادین»دا، سلووکی کردووە وزۆر بەڕێزەوە بۆی ڕوانیوە و لەسەر داوا وفەرمانی ئەو کتێبی «الفضیلة»ی داناوە ولە پێشەکییەکەیدا ستایشی کردووە.

٣- «شێخ عەبدوڕەحمانی ئەبولوەفا» کوڕی «شێخی سیراجەددین» وبرای «شێخ محەمەد بەهادین»، ئەم زاتەیش یەکێك بووە لە شێخە گەورە وبەڕێزەکانی مەولەوی، مەولەوی کتێبی «العقیدة المرضیة»ی لەسەر خواستی ئەم شێخە داناوە، ئەم زاتە لەبەغداد کۆچی دوایی کردووە ولەگۆڕستانی «شێخ عەبدولقادری گەیلانی» بەخاك سپێرراوە.

٤- «شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخی سیراجەدین»، ئەم زاتە پیاوێکی زانا وئەدیب بووە، حاشیەی بەسەر مەسنەوەی ڕۆمی و«العقیدة المرضیة»ی مەولەوییەوە هەیە.

مەولەوی بە شیعر ومەتەڵ ناوی ئەم شێخەی هێناوە کە دەڵێ:

یـــار وەفــادار شـــەرت و بـەیـن بـێ شـۆ
چـــون نـــوور دیـــدەی مـەعـدوومی مەبۆ
وەختێ بەندەی وێش بەی حاڵ وە چەم دی
ئـــەســـریـــن وە چـــەمـدا ریْزا و پەشێوبی

٥- «شێخ عومەر-شێخی ضیائەدین»- کوڕی «شێخ عوسمانی سیراجەدین»، ئەم زاتەش جگە لە شێخایەتییەکەی زانا وئەدیب وشاعیر بووە و، شیعری بە کوردی وفارسی هەیە، کتێبی زۆر خۆش ویستووە وکتێبخانەیەکی گەورەی نایابی بووە، ئەم زاتە ساڵی«١٣١٨ك» کۆچی دوایی کردووە.

٦- «شێخی حیسامەدین»: شێخ عەلی کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخی سیراجەدین، ئەمیش وەك باوك وباپیر ومامەکانی زانا وئەدیب وشاعیر بووە، ڕێزێکی زۆری لەلای زانایان و گەورە پیاوان هەبووە،

یەکێك لە شوێنەوارە نایابەکانی کەشکۆڵی شێخی حیسامەدینە، کە یەکێکە لە کەشکۆڵە نایاب وپڕ بایەخەکانی کتێبخانەی کوردی[1].

٧- «شێخ مەعرووفی نۆدێی»: مەولەوی ماوەیەك لە خزمەتی ئەم زاتەدا خەریکی خوێندن بووە وسوودی زۆری لێوەرگرتووە، «شێخ مەعرووف» کە توانای باڵای مەولەوی دیوە، داوای لێ کردووە کە ئەرکی تەدریسی «مزگەوتی خانەقا»ی «مەولانا خالید» بگرێتە ئەستۆ، بەڵام مەولەوی قبووڵی نەکردووە.

٨- «شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی»: مەولەوی ماوەیەك لە خزمەت «شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی»دا خوێندوویە ولە دەریای زانستی بەهرەمەند بووە.

٩- «مامۆستا مەلا عەبدوڕڕەحمانی نۆتشیی»: مەولەوی بەشی کۆتایی خوێندنی لە لای ئەم مامۆستا لە شاری سلێمانی تەواو کردووە وئیجازەی «تەدریس»ی لەخزمەتیدا وەرگرتووە.

١٠- شێخ محەمەد جەسیمی مەردۆخی «حوججەتولئیسلام»: کە یەکێك لە زانا بەناوبانگەکانی «زانستی کەلام» بووە لەشاری سنەدا، وجێگەی ڕێزی تایبەتی مەولەوی بووە.

١١- «مەلا حامیدی هەورامی-بێسارانی»: کاتبی «شێخی سیراجەددین»، ئەم مامۆستا نێوانی لەگەڵ مەولەوی دا زۆر خۆش بووە، «مەلا حامید» نوسخەیەکی (شرح المواقف) بە خەتی خۆی بۆ مەولەوی نووسیوەتەوە.

١٢- «مەلا محەمەدی قازیی جوانڕۆ وجاف»: کە تا دەوروبەری ساڵی«١٢٩٠ك»، لەژیاندا بووە، شارەزایی تەواوی لە ئەدەبی فارسیی وعەرەبی وعیبریدا هەبووە، مەولەوی ئەو کاتانەی لە «قەڵای جوانڕۆ» بوایەت، دەچووە خزمەتی ودەرزی ئەدەبی لە خزمەتدا دەخوێند[2].

(١) دیوانی مەولەوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، (ب١/ ل ١٥٨-١٥٩).

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، (ب١/ل١٣٣-١٣٦).

# باسی هەشتەم: مەولەوی لە دیدی ئەدیباندا

«محەمەد سالّح دیلان» دەڵێت: "مەولەوی بلیمەتێکی بیرکەرەوەیە پێش ئەوەی شاعیرێکی بڵند بێ، شۆڕشگێڕێکە لەشعیری کوردیدا لەکاتێکدا ئەو لەسەردەمێکا بووە کە ئەدەبی کورد، ئەدەبی فارسی کاری تێ کردووە، نەتەوەی کورد خۆی بەبەختیار ئەزانێ کە خاوەن ئەم مێشکە بەرز وتیژ بینەی مەولەوییە" [1].

مامۆستا «عەلائەددین سەججادی» دەلێت: "بێ شك مەولەوی بەرزتر شاعیری سەدەی نۆزدەهەمی کوردە تا ئەم تاریخە و بگرە هی پێشەوەش، نەوەك هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەگەر بەراوردی خەیاڵی شیعری مەولەوی لەگەڵ شاعیرەکانی سەدەی نۆزدەهەمی غەیری کورددا بکرێ هەموو زمان وقەڵەمێك دان بەوەدا ئەنێ کەفیکری بەرزی مەولەوی لەسەر هەموویانەوەیە، نازکی خەیاڵ، تیژی بیر، وردی مەعنا، جوانی وشە وڕاکێشانی دڵ بەعیباراتی ڕەنگین وبزواندنەوەی تەلی عاتیفە مەگەر هەر لەدەستی مەولەوی هاتبێ، یاخود مەگەر هەر خاتوو عەنبەر توانیبێتی لەپەردەیەکی نهێنیەوە خۆی بنوێنێ بۆ مەولەوی بۆ ئەوە قاپی شیعری بۆ بکرێتەوە وببێ بەو مەولەوییە کە قەڵەم لە باسی شیعر وزەوقیدا کۆڵە!" [2].

«پیرەمێرد»ی شاعیر دەڵێت: "ئەدەبیاتی زۆر قەوم وناودارانی زۆر میللەتم دیوە هیچیان ئەوەندەی ڕۆحی مەولەوی پڕ جۆش وخرۆش نی یە، وشیعرەکانی وەك ئاوی حەیات لە توێی میدادا" [3] وەهەروەها دەڵێت: "ئۆخ بۆیە مەولەویم خۆش ئەوێ وشیفتە وشەیدای سۆز ونالّەی ئەوم کە پەردە پەردە شوێنە شیرینەکانی خاکەکەم ونیشتمانەکەمی بە فەردی فەردەوە، بەفەڕ وزیبیێکی دڵ نەوەردەوە پێ نیشان داوم وبەسینەما خۆشەویستیی ئەوانی چەسپاندوەتە سینەمەوە" [4].

---

(١) بارانی سلێمانی (بەرهەمی بلاۆنەکراوە ولەیادکراوەی محمد سالّح دیلان: ئومێد ئاشنا، بلاۆکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠١ز، ل٨٩.

(٢) مێژووی ئەدەبی کوردی: عەلائەددین سەججادی، ل٢٨٠.

(٣) پیرەمێرد وپێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان وبەرهەمەکانی: ئومێد ئاشنا، (ب١/ل٤٦-٤٧).

(٤) میهرەجانی مەولەوی، ل٩٧-٩٨.

**بۆ ڕۆحی مەولەوی:**

ئەی بەناو مەعدووم، وەی بەگیان مەوجود
عـەدەم زیـنـنـەتـــی، داوە بـــە وجــود
بـا مـەعدوومیش بیت، نـامـری هەر ئەوی
شیعرت بـانگ ئەکـا، هـا، هـا، مەولـەوی
سـۆزی شـیـعـری تـۆ لــە (ئـاتـەشگا)وە
ئـاگـری نـەورۆزی خــســتــە دنـیـاوە
ئـەو حــەوتــەوانــەی لـــە کـایـەدایــە
هـــەر شــیر وشـێـری وشـــتری تـیـایە
شیعری تــۆ لــەسـەر، چـیایی کوردستان
لـــەرزە ئـەخــاتـە سـوپـەری دەوران[1].

«گۆران»ی شاعیر دەڵێت:"من لەشیعردا ئیلهامم لە مەولەوی وەرگرتووە".

«شێخ محەممەدی خاڵ» دەڵێت:"مەولەوی جێی سەر سوڕمانە کە شیعری زۆر هەیە وزادەی بیری خۆیەتی وبەبیری کەسی تردا نەهاتووە"[2]، هەروەها دەڵێت "ملا عبدالرحیمی مەولەوی تاوگۆزی، فیردەوسی کورد لە شیعری فارسی، ومتنبی کورد لە شیعری عەرەبی، وخواوەندی شاعیرانی کورد لە شیعری کوریدا"[3].

مامۆستا«عەبدوالکەریمی مودەڕڕیس» دەڵێ:"ئاخ مەولەوی! خۆزگە بەو سۆز وعەشق وتێکۆشینەوە لە ولاتێکدا ئەبووی هەرچیت ئەنووسی وەرئەگێڕدار ولەچاپ ئەدرا، تا جیهانی کوردستان، بەڵکو هەموو جیهانی موسڵمانان بە تەئلیفات وئاسار وئەشعارت ڕووناك ببوایەتەوە، تا هەموو دنیا بیزانیایە بێشەی کوردستان چ جۆرە شێرێکی تێدابووە"[4].

---

(١) پیرەمێرد وپێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان وبەرهەمەکانی: ئومێد ئاشنا، (ب١/ل٣٥٥-٣٥٦).

(٢) دیوانی مەولەوی لەهەورامی بۆ سۆرانی: محەممەد ئەمینی ئەردەلانی، ل١٢.

(٣) مفتی زەهاوی: محەمەدی خاڵ، چاپخانەی معارف-بەغداد، ١٣٧٣ك-١٩٥٣ز، ل١٦.

(٤) یادی مەردان: مەلا عبدالکریمی مدریس، (ب٢/ل٣٦٩).

ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی ڕووسی «مینۆرسکی» لە ئاهەنگی هەزارەی شاعیری گەورەی فارس «ئەبولقاسمی فیردەوسی»دا وتوویەتی:"دوو کەس هەن لە ئەدەبییاتی ڕۆژهەڵاتدا پلەی یەکەم ودوومیان داگیر کردووە: یەکەم ئەبولقاسمی فیردەوسی و، دووەم: سەیید عەبدوڕڕەحیمی مەولەوی"[1].

هەر لەبارەی توانا ولێهاتوویی مەولەوییە «مەلا حامیدی کاتب» «١٢٢٥-١٣١٠ك»، هاوتەمەن وهاوڕێ وهاو تەریقەتی کە باسی مەولەوی دەکات دیارە باسەکە لە کەسێکی وەهاوە بایەخێکی تایبەتیتری هەیە، دەنوسێ:

"دووەم لە خەلیفەکانی شێخی سیراجەدین مەلا عەبدوڕەحیمی مەولەوییە، کە پیاوێکی بیرتیژ وبلیمەتە، ئەم پیاوە لەخانەوادەی سەیدەکانە وڕشتەی پشتی دەچێتەوە سەر مەلا ئەبووبەکری موصەننیف، مەولەوی پیاوێکە لە هەموو زانیارییەکاندا باڵادەست، بەتایبەتی لە هونەری هاوردوبردی قسە وموجادەلەدا کەس لێی ناباتەوە، لەتەك ئەوەشدا گەلێ نەرم ونیان وبەویژدانە و، دان بە ڕێز وپلەی هاوەڵان وهاودەمانیدا دەنێ و، خۆی بەکەمترین وبچووکترین کەسی ئەم خانەوادە-نەقشبەندیی- دادەنێ و، هەرگیز ڕەخنە لە زانایان وپیاوانی تەریقەت ناگرێ"[2].

«کاکەی فەلاح» لە هۆنراوەیەکدا وەسفی مەولەوی دەکات ودەڵێت:

لـــــە گـــیـــانی پـــاکی مـەولــەوی دانا
ئـــەوەی هـەڵـبـەسـتی نـــاســـکـی دانا
مـــژدە بـــێ ئـــەوا دیـــوانـی شـیـعـری
دەرچـــــوو، ئـەگـەڕێ بـە نـاو کـوردانا

***

(١) میهرەجانی مەولەوی، ل٢٣٠.

(٢) بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد: محەمەد عەلی قەرداغی، (ب٥/ل١٨٩).

ئـای لــە نـاسـکـی خـەیـاڵـی جـوانی
سـەرچـاوەی سـۆزی ڕوون و ڕەوانـی
لە گەرمیی هەست و ساردیی هەناسەی
بـەهـرە و سـەلـیـقـەی ناو شیعرەکانی
***
ئـای لـەبـەر قووڵیی ئەندێشە و هۆشی
دەریـای بـێ بـنی جـۆش و خـرۆشـی
بـۆ بـیری ورد و تـاسـە و پـەرۆشـی
بـۆ چـەپـکـە گوڵی باخی بۆن خۆشی
***
ئـای بـۆ سـەنـعـەت و بـۆ وردەکاری
بـۆ دەریـای شـیعـری پـڕ لـە مرواری
بـۆ گـەنجینـەکـەی دوڕ و گـەوهـەری
جـێـی شـانـازیـیـە بـۆ کـوردەواری
***
ئـای لـەبـەر شـیـعـری تـەڕ و پاراوی
بـۆن و بـەرامـەی وەکـوو گـوڵاوی
ڕوونـە وەك دڵـی ساف و بێ گەردی
ڕەوانـە وەکـوو فـرمـێسکی چاوی
***
ئـای لـە بـڵـێـسەی خۆشەویستی ئەو
سـووتـانـی بـۆتـەی هەق پەرستی ئەو
ئای لەبەر نەشئەی بادەی عەشقەکەی
ئای لە سۆزی ئەو،وای لە هەستی ئەو

***

ئـای بـۆ کـلـۆڵی حاڵی بێ حاڵی
بۆ ڕەنگـی زەرد و بـۆ نـاڵەنـاڵـی
هـاوار و دادی ڕۆژ و شـــەوانـــی
بۆ بەستە و دەف و بادە و شمشاڵی

***

ئای بۆ گیانەکەی پڕ لە وەفاکەی
بۆ دەروونەکەی کەیلی جەفاکەی
ئـای بۆ دڵەکەی زەدەی سزاکەی
دوور لەسەیران وسەیر وسەفاکەی

***

ئـای بـۆ عـیززەتـی نەفسی بڵندی
بۆ خـۆی هەژار و دڵ دەوڵەمەندی
ئـای بـۆ چاوتێری و برسێتی حاڵی
ڕەوشـتی بەرزی یەك یەك پەسەندی

***

شـیـعـری مەولەوی گوڵێکی وایە
ئـــەگـــەشـێـتـەوە هـەتـاهـەتـایـە
لــە نـاخـی دڵ و دەروونـی کوردا
بـنـجـی داکـوتـا لـە ڕیـشـە نایە[1]

(١) دیوانی کاکەی فەلاح: بنەماڵەی شاعیر، ٢٠٠٤ز، ل٦٠-٦١.

# بەشی سێیەم: سۆفیگەری مەولەوی

- باسی یەکەم: مەقامەکان لەلای مەولەوی .
- باسی دووەم: حاڵەکان لەلای مەولەوی.
- باسی سییێەم: مەی وساقی لای مەولەوی.
- باسی چوارەم: صلاْواتدان و پێغەمبەرﷺ.
- باسی پێنجەم: ئیسرا ومیعراج.
- باسی شەشەم: مرۆڤ دۆستی ولێبووردەیی مەولەوی.

# بەشی سێیەم: سۆفیگەری مەولەوی
## باسی یەکەم: مەقامەکان لای مەولەوی

بە واتای وەستان وخەریکبوونی ڕێبوار دێت لەهەوڵ ووەرزشە گیانی ولەشیەکانی بەرامبەر خوای گەورە[١]، وشەی مەقام لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراوە کە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعۡلُومٌ﴾ ﴿الصافات: ١٦٤﴾ و﴿ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ﴾ ﴿إبراهيم: ١٤﴾.

«مەقام» بەهۆی کۆشش ووەرزشی قورسەوە بەدەست دێت واتا شتێکی خواییە ولەخۆوە نیە، ڕێبوار هەر مەقامێکی تەواوکرد بەرە ومەقامێکی تر دەڕوا، مەقامەکانیش بەگشتی ئەم حەوتەن «التوبة، الورع، الزهد، الفقر، الصبر، الرضا، التوكل»[٢]، بەلاّم لە هەندێ سەرچاوەی تر دەبنە مەقام، واتە جگە لەمانەی سەرەوە «شكر، خوف، رجاء »ی بۆ زیاد دەکەن[٣].

مەقام بۆیە ناوی لێنراوە مەقام چونکە بەردەوام وچەسپاوە، بەلاّم حاڵ لە گۆڕاندایە بۆیە پێی گوتراوە حاڵ[٤].

ئێستاش باسی مەقامەکان دەکەین لەلای مەولەوی، هەر یەکەیان چەند دێڕێکی لەسەر ئەنوسین، ئەوانیش:

### ١) تۆبە (التوبة):

کە ڕێبوار بیەوێ بێتە ناو هەر تەریقەتێکەوە سەرەتا بە «تۆبە» دەست پێ دەکا، لەبارەی تۆبەوە «ذوالنون» دەڵێ: بەگشتی تۆبە سێ جۆرە، تۆبەی مرۆڤی ئاسایی لە گوناهەکانە، تۆبەی تایبەتمەندەکان لە بێ ئاگاییە، تۆبەی پێغەمبەرانیش لەو پلە وپایە بەرزانەیە کە جگە لەوان، پێی گەیشتوونە[٥]، «ئیبن عەتا» دەفەرموێت: "تەوبە دوو جۆرە، تەوبەیەکی پشت پێ بەستراو وتەوبەیەکی

---

(١) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٦٥.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥.

(٣) عوارف المعارف: للإمام شهاب الدين أبي حفص عمر السهروردي، ل٢٣٢.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٥.

(٥) غاية المطلوب وأعظم المنة فيما يغفر الله به الذنوب ويوجب الجنة: ابن الديبع الشيباني، المحقق: رضا محمد صفي الدين السنوسي، مؤسسة الريان - المكتبة المكية، چ١، ١٤١٩ك – ١٩٩٨ز، ل٤٤.

وەلاَمدراوە، تەوبەی پشت پێ بەستراو ئەویە بەندە تۆبە دەکات لەترسی لە سزای خوای گەورە، وتەوبەی وەلاَمدراوەش ئەویە بەندە تۆبە دەکات لەشەرما لەئاست ڕێزی خوای گەورەدا"[1]، تەوبەکردن ئەبێتە هۆی ئەوەی خۆشەویستی خوای گەورە بەدەست بهێنین، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ ﴿البقرە: ٢٢٢﴾.

«مەولەوی» دەربارەی تۆبە دەڵێ:

دڵــە چەند مەستیت جەم بی نە سەردا

چەند کاری ئارۆت وستەو ڕۆی فەردا

شــەرتــێوم نییەن جــە بــێ شەرتیی تــۆ

ڕوو ســیــای تــۆبــەی سەد فەردا نەبۆ

نــەکــەفــتی ئــەو ڕا پەی حەق پەرستی

تا بی وە هەمتای مەستی پــای سستی

واتە: ئای ئەی دڵ چەند مەستی کۆبووەتەوە لەسەرتا وچەند ئیشی ئەمڕۆت ئەخەیتە سبەینێ، بەهۆی بێ شەرتی تۆوە شەرتێکم نییە ڕوو ڕەشی لای تۆبەی سەد سبەینێ نەبووبێ، مەبەستی ئەوەیە هەرچی شەرت ئەکەم کە خراپە نەکەم وتۆبە لەو خراپانە ئەکەم، بۆ سبەینێ ئەو شەرتە ئەشکێنم ودیسانەوە تۆبە ئەکەمەوە وشەرتەکەم لە حزووری ئەو تۆبانەدا ڕوو ڕەش ئەبێ.

هەروەها بە نەفسی خۆی دەڵێ نەکەوتیتە ڕێی حەق پەرەستی تا پیری بوو بە هاوڕێی سەرخۆشییەکەت وکەڵکت پێوە نەما[2].

---

(١) الغنية لطالبي طريق الحق عز وجل: عبد القادر بن موسى الكيلاني، المحقق: أبو عبد الرحمن صلاح بن محمد بن عويضة، دار الكتب العلمية-بەيروت، چ١، ١٤١٧ك- ١٩٩٧ز، (ب١/ل٢٦٩).

(٢) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٢٦٢.

## ٢) وەرع (الورع):

«وەرع» بریتیە لە خۆ پاراستن وهەڵنەخلیسکان لەرێگەی شەریعەتدا وبەوردی پرسینەوەیە لە حەلاڵ وحەرام وپارێزیکردنیشە لەشتی گومان لێکراو[١]، «وەرع» بریتیە لە پابەند بوون بەکاری سوپاسکراو کە موافەقەتی شەرع وعورف وپیاوەتیە[٢]، ئەبووبەکری کەتانی دەڵێت:" «وەرع» بریتیە لە پابەند بوون بە ئەدەب ورەوشتەوە وچاککردنی نەفسە"[٣]، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو رێبوارێکی هەموو تەریقەتێك خۆی بپارێزیت ودوور بکەوێتەوە لە گومان وشوبهەکان وترسی هەبێت لەوەی بکەوێتە ناو حەرامکراوەکان[٤].

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت:"خير دينكم الورع"[٥] واتە: باشی دینداریتان لە وەرع وخۆپارێزیدایە، ئەوانەی خەریکی وەرعن سێ چینن:

١) ئەوانەی خۆیان لەشتی گومان لێکراو دەپارێزن.

٢) ئەوانەی بەهۆی دڵیانەوە ئاگادار دەکرێن لە گومانداری ئەو شتە.

٣) ئەو خواناسە وەجدگرتووانە کە خۆیان لەو شتانە دەپارێزن کە بێ ئاگایان دەکات لەخودا[٦].

---

(١) حاشيتا قليوبي وعميرة: أحمد سلامة القليوبي وأحمد البرلسي عميرة، دار الفكر – بەيرووت، ١٤١٥ك-١٩٩٥ز، (ب٣/ل٣٤٤). التوكل: القاضي أبو يعلى، محمد بن الحسين بن محمد بن خلف المعروف بـ ابن الفراء، حققه وعلق عليه: يوسف بن علي الطريف، دار الميمان للنشر والتوزيع- رياض، چ١، ١٤٣٥ك- ٢٠١٤ز، ل٨٠.

(٢) بريقة محمودية في شرح طريقة محمدية وشريعة نبوية في سيرة أحمدية: محمد بن محمد بن مصطفى بن عثمان، أبو سعيد الخادمي الحنفي، مطبعة الحلبي-سوريا، ١٣٤٨ك، (ب٢/ل٣٦).

(٣) كتاب الزهد الكبير: أحمد بن الحسين بن علي بن موسى الخُسْرَوْجِردي الخراساني، أبو بكر البيهقي، المحقق: عامر أحمد حيدر، مؤسسة الكتب الثقافية - بەيرووت، چ٣، ١٩٩٦ز، ل٣١٨.

(٤) الأصول الدينية في شرح الرسالة العلاوية: محمد بن سليمان الكردي المدني، ترجمه، تحقيق: عاصم إبراهيم الكيالي-محمد المنور المدني، دار الكتب العلمية- بەيرووت، ٢٠١٥ز، ل٣٦٠.

(٥) المستدرك على الصحيحين: الإمام الحافظ أبو عبد الله الحاكم النيسابوري، بإشراف: د. يوسف المرعشلي ، دار المعرفة - بەيرووت، ژمارەی فەرموودە ٣١٣، (ب١/ل٩٢).

(٦) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٧٠-٧١.

مەولەوی لە دوو شیعریدا ووشەی «وەرع»ی بەکارهێناوە، ئەویش یەکەمیان لەلاواندنەوەی زانایەکی گەورەدا وتووە وبۆ باوکی ئەو زانایەی ناردووە، کەهەواڵی مەرگی کوڕەکەی بۆ مەولەوی ناردووە، مامۆستا «عەبدولکەریمی مودەڕڕیس» دەڵێ داخەکەم نەمزانی ئەو زانایە کێ بووە[1]، مەولەوی دەڵێ:

حەلاڵی عوقدەی ڕاگەی شەرعم ڕۆ
ڕەهنومای تەریق جادەی وەرعم ڕۆ
کێ نە تەفاسیر قورئان بدۆ دەم
کێ بۆ ئەحادیس ڕەسوول کەرۆ جەم[2]

مەولەوی لەم لاواندنەوەدا دەڵێ: گرێ کەرەوەی ڕێگەی شەرعم ڕۆ، ڕێ پیشاندەری ڕێگەی وەرعم ڕۆ، ئیتر کێ بێ باسی تەفسیر بکا و کێ بێ فەرموودەکان کۆبکاتەوە وباسیان بکات، مەولەوی لێرەدا دوای ئەوەی کە باسی شەرع ئەکات یەکسەر خەم لە وەرع ئەخوات وەك بلێی شیکردنەوەی بۆ فەرموودەکەی سەرەوە کردووە.

مەولەوی لە شیعرێکی تردا کە قسە لەگەڵ «شێخی زیائەددین» ئەکا، کە هەندێ کەس وایان تێگەیاندبێ گوایە مەولەوی ساردە لە گەڵیا وئەمیش بەم قەصیدەیە پاکانە بۆ خۆی دەکات، ودەڵێ:

وە دیدەی مەخموور شیرین تەرزی تۆ
وە نەشئەی شێوەی باڵای بەرزی تۆ
نە شێخ، نە مەڵلا، نە قازی ڕووی شەرع
نە سۆفی و عابید ئەهلی تەقوا و وەرع
نییەن داخی تۆش نەبۆ نە تۆی دڵ
موشکولەن ئازیز جەمین پەڕەی گوڵ[3]

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٣٢٢.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٦.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨٦-٤٨٧.

واتە: بە چاوە مەستە جوانەکانت و بەلەنجەولارەی بالاّی بەرزت، هیچ شێخ ومەلا وقازییەکی ڕووی شەرع وهیچ سۆفی وخواپەرستێکی ئەهلی تەقوا و وەرع وخواپەرستی نیە، داخی خۆشەویستی تۆی نەبێ لەدلاّ وزۆر زەحمەتە شتی وا ڕووبدا[١].

سەرگوزەشتەیەك هەیە لە نێوان کاك ئەحمەدی شێخ ومەولەوی کە بەڵگەیە لەسەر وەرع وخواپەرستی هەروودوکیان، ئەویش:

ڕۆژێکیان مەولەوی ئەچێ بۆ «سلێمانی» بۆ زیارەتی «کاك ئەحمەدی شێخ» دوای نوێژی عەسر بەخزمەتی ئەگا، «کاك ئەحمەد» یش زۆر ڕێزی ئەگرێ وپێی ئەفەرموێ: مەولەوی حەز ئەکەم نەسیحەتێکم بکەی!، مەولەوی بێ دەنگ ئەبێ، «کاك ئەحمەد» داواکەی دووبارە ئەکاتەوە، بەلاّم مەولەوی هەر دەنگ ناکا، شێخ بۆ جاری سێهەم داواکەی تازە ئەکاتەوە، ئەمجارە مەولەوی ئەڵێ: یاشێخ نەسحەت یان ئەمر بەچاکەیە یا نەهی لە خراپە، جاری یەکەم ورد بوومەوە واجبێك وسونەتێکم نەدی تۆ نەیکەیت تا پێت بڵێم بیکە، جاری دووهەمیش ورد بوومەوە حەرامێك و مەکروهێکم نەدی تۆ بیکەیت تا پێت بڵێم مەیکە، ئەمجارە پێت ئەڵێم دیارە شەیتان زۆر دڵگرانە لێت، دەخیلم ئاگات لە خۆت بێ تەفرەت نەدا وتووشی خراپەیەکت نەکا.. «کاك ئەحمەد» ئەم جوابەی مەولەوی زۆر پێ خۆش ئەبێ، وەجد ئەیگرێ ودەس ئەکا بە گریان و ئەندازەیەکی باش فرمێسك بە خوڕ ئەڕێژێ[٢].

هەروەها جارێك «محمەد پاشای جاف» لە گەرمیان نەخۆش ئەبێ، مەولەوی ئەچێ بۆ لای بۆ هەواڵ پرسینی، پاشا بە مەولەوی ئەڵێ: دوعایەکی خێری بۆ بکات و ئامۆژگارییەکیشی بکات، مەولەویش ئەڵێ: بۆ دوعای خێر درێغی ناکەم، ئامۆژگارییەکەیشم ئەوەیە: تۆ خاوەنی دوو شتی: ماڵی دنیا، وئیمان.

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٤٨٧.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠.

**ماڵەکەت هێشتا خۆت ساغی «مەحموود بەگ» و«عوسمان بەگ» ومناڵەکانی تر دابەشیان کردووە لە نێوان خۆیانا، ئیمانشت شەیتان خۆی بۆ مەلاس داوە، ماڵەکەت هەرچی لێ دێ قەیدی نییە، چونکە ماڵی باوك هەر بۆ ئەولادە، دەخیلتم ئاگات لە ئیمانت بێ شەیتان بە تالآن نەیبا[1].**

**مەولەوی لە قەصیدەیەکدا باس لەوە دەکات کە ترسی لەوە هەیە شەیتان خەرمانی عیبادەتی بە کا ودانەوە ببات، دەڵێ:**

**هەر کاتێ زانای "کام" وە دانەوە**

**شـەو شەیتان مالاَ وە خەرمانەوە**

**واتە: هاکا هەر ئەوەندەت زانی شەوێك شەیتان هاتە سەر خەرمانی کردەوەکانم، هەر بە «کا» ودانی خەرمانەکەمەوە هەمووی ماشییەوە وبردی[2].**

## ٣) زوهد (الزهد):

**«زوهد» ئارام گرتنە لە بارەگای خوا ودوورکەوتنەوەیە لە هەموو گەنجینەی جیهان یاخود دەست شۆرینە لەهەموو سامانێك و دڵ ترازانە لەهەموو هەڵپەکردنێك بۆ ماڵی دنیا[3]، «زوهد» بریتیە لە وازهێنان لەشتێ بۆ شتێکی چاکتر، ئەوەی نەفسی نەیەوێ ووازی لێ بێنێ زوهد نییە، بەڵکو زاهید ئەو کەسەیە واز لەپوول ودراو بێنێ[4]، هەروەها «زوهد» بریتیە لە ڕقبوونەوە ودوورکەوتنەوە لەجیهان یاخۆ وازهێنانە لەخۆشی وچێژی جیهان لەپێناو چێژی ڕۆژی دوای[5]، «ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم» دەفەرموێت:"«زوهد» سێ جۆرە: یەکەم زوهدی واجب «وازهێنانە لە حەرام»، دووەم زوهدی سوننەت**

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل ٢٧-٢٨، و دیوانی مەولەوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، (ب١/ل ١٨٠).

(٢) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٥٨٧.

(٣) کتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل ٧٢.

(٤) إحیاء علوم الدین: أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي، (ب٤/ل٢١٦-٢١٧).

(٥) کتاب التعریفات: علي بن محمد بن علي الزین الشریف الجرجاني، المحقق: ضبطه وصححه جماعة من العلماء بإشراف الناشر، دار الکتب العلمیة -بەیرووت، چ١، ١٤٠٣ك-١٩٨٣ز، ل١١٥.

«وازهێنانه له شتی گوماناوی وشبوهات»، سێ یەم زوهدی فەزیلّەت «وازهێنانه له حەلاڵ»"[1].
هەروەها «سری سەقتی» لەبارەی «زوهد»ەوە دەڵێ: "دڵ لەسەر ئەو شتانه نەمێنێت کە لەناو دەست نەماون"[2].

ئیمامی «ئەحمەی کوڕی حەنبەل» دەفەرمویت:"«زوهد» سێ جۆری هەیە: یەکەم وازهێنانه لەحەرام ئەویش زوهدی زۆربەی خەڵکیە، دووەم وازهێنان لە حەلاڵێك کە وابەستەی دونیات بکات ئەمە زوهدی کەسە تایبەتەکانە، سێ یەم وازهێنان لەو شتانەی کە خوای گەورە لەبیری بەندە دەباتەوە ئەمەش زوهدی خواناس وعاریفەکانە"[3].

مەولەوی لەبارەی ئابوورییەوە هەرگیز ژیانێکی خۆشی ڕانەبواردووە، هەرگیز ئامادە نەبووە لەپێناو ژیانی دونیادا دەست لە عیزەتی نەفسی خۆی هەڵبگرێت، فەرمانڕەوایانی قاجاری وئەردەلانی گەلێ جار بانگیان کردووەتە لای خۆیان ودێهات و موڵکیان داوەتێ، بەلاّم ئەو قوبووڵی نەکردووە وهەرگیز نەیویستووە خزم وکەس وکارەکانی وناوچە کرێنی «تاوگۆزی» بەجێ بێڵێ وبە موڵکی دنیای نەگۆڕیوەتەوە، بۆن مونە فەرهاد میرزای مامی ناصروددین شا داوای لێ کردووە بڕوا بۆ ئێران وهەر موڵکێ دڵی ئەیگرێ هەڵی بژێرێ بۆ خۆی، هەروەها «غولاّم شا خانی ئەردەلان»یش داوای لێ کردووە بچێ بۆ ناوچەی سنە ودێی «زەلان» وەربگرێ بۆ خۆی، بەلاّم مەولەوی هەر ئەوەی پێ باش بووە هەرچۆن بووە لە «سەرشاتە» کرێنەکەی خۆی بمێنێتەوە[4].

---

(١) تنبيه الغافلين بأحاديث سيد الأنبياء والمرسلين للسمرقندي: أبو الليث نصر بن محمد بن أحمد بن إبراهيم السمرقندي، حققه وعلق عليه: يوسف علي بديوي، دار ابن كثير- بەيرووت، چ٣، ١٤٢١ك- ٢٠٠٠ز، ل٤٧٤، وقوت القلوب في معاملة المحبوب ووصف طريق المريد إلى مقام التوحيد: محمد بن علي بن عطية الحارثي، (ب١/ل٤٤٥).

(٢) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل ٧٢.

(٣) الآداب الشرعية: عبد الله محمد بن مفلح المقدسي، المحقق: شعيب الأرناؤوط + عمر القيام، مؤسسة الرسالة-بەيرووت، چ٣، ١٤١٩ك- ١٩٩٩ز، (ب٢/ل٢٣١)، والفتوحات الربانية على الأذكار النووية: محمد بن علان الصديقي الشافعي الأشعري المكي، جمعية النشر والتأليف الأزهرية، (ب ٧/ ل٣٣٤)، وموسوعة الأخلاق: خالد بن جمعة بن عثمان الخراز، مكتبة أهل الأثر للنشر والتوزيع-كوەيت، چ١، ١٤٣٠ك-٢٠٠٩ز، ل٣١١، والجامع لعلوم الإمام أحمد - الأدب والزهد الإمام: أبو عبد الله أحمد بن حنبل: خالد الرباط، سيد عزت عيد، دار الفلاح للبحث العلمي وتحقيق التراث، الفيوم-ميسر، چ١، ١٤٣٠ك-٢٠٠٩ز، (ب٢٠/ل٢٦٩).

(٤) يادى مەردان: مەلا عبدالكريمى مدريس، (ب٢/ل٣٧٧-٣٧٨).

مەولەوی لەگەڵ دەستکورتی ونەدارییەکەی دا بێ ئەوەی مـنـەتی کەس هەڵبگرێ، خەریکی دەرس وتنەوە بووە، وخۆی ژیانی فەقێکانی خۆی دابین کردووە.

مەولەوی لەگەڵ ئەوەدا، بەهۆی پلەی باڵای زانستی وئەدەبی بێ وێنەیەوە جێگەی ڕێزی پیاوانی وەك «محەمەد پاشا» و«مەحمود پاشای جاف»، و«بارام بەگی مورادی»، و«عەلی ئەکبەرخانی شەرەفولملکی ئەردەڵانی»، و«حەبیبوڵڵاخانی باوەجانی» و... کەسانی دی بووە، وشانازییان بەوەوە کردووە، مەولەوی ڕێگەیان بدات خزمەتێکی بکەن، ونزیکایەتییان لەمەولەوی، بە مایەیی پیرۆزی زانیوە، بەڵام مەولەوی ڕازی نەبووە-نەك بۆ خۆی- بۆ حوجرە ومەدرەسە وفەقێکانیشی شتێ لە کەس وەربگرێت.

مەولەوی خۆی بە گا جووتی کردووە، وزەوی خۆی تۆو کردووە، وپاشانیش خۆی درەوی کردووە، وهێناویەتییە ناو، هەر بەوە ژیانی خۆی وفەقێکانی دابین کردووە، ووابووە، ئەو بەری ڕەنجەی کورتی هێناوە وبەشێکی ساڵەکەی بە بەڕەوو بەسەربردووە.

ئەمە لەکاتێکدا بووە گەورە پیاوان وبەرپرسانی وەك «فەرهاد میرزا» وکەسانی تر خۆیان داوایان لێ کردووە بچێتە شوێنێکی وەك سنەی پایتەختی ئەردەڵانی ئەو سەردەمە وزۆر بە ئاسودەیی بژی وزانست بڵاوبکاتەوە[1].

## ٤) ڕەزا (**الرضا**):

«ڕەزا» ئەوەیە دڵی ڕێبوار لەژێر حوکمی خوا ئارام بگرێ، «ذالنون» لەبارەی ڕەزاوە دەڵێ: "دڵ خۆشبوونە بە قەزا وقەدەرەی خوا"[2]، «ڕەزا» بەری خۆشەویستییە وبەرزترین پایەیی نزیکەکانە لەخوا، ڕاستی ڕەزا نهێنییە تەنیا ئەوانەی زانست وتەئویل لە خواوە وەردەگرن شتێکی لێ دەزانن[3]، ئەم زاراوەیە لە قورئاندا هاتووە وبە واتای قایل بوون وگلەی نەکردن دێ خوای گەورە دەفەرموێت ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ﴾ ﴿المائدة: ١١٩﴾، ئیمامی «ئەحمەدی کوڕی حەنبەل» لەبارەی ڕەزاوە دەفەرموێت:

---

(١) دیوانی مەولەوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، (ب١/ل١١١-١١٢).

(٢) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٨٠.

(٣) إحياء علوم الدين: أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي، (ب٤/ل٣٤٣).

"ڕەزابوون سێ شتە: خۆدانە دەست خوا، دڵخۆشی بەتاڵیی قەزا، تەگبیر نەکردنە بۆ نەفس تا خوا خۆی حوکمی بەسەرا دەردەکا"[1]. مەولەوی دەربارەی ڕەزا ڕووی دەمی دەکاتە نەفسی خۆیی وهەمووان دەڵێ:

گەر زەرەی شعوور هەیە پێتەوە

کـە وتیان خـــودا ئـەبڕێـتـەوە

واتە: ئەگەر تۆسقاڵێ هەست وتێگەیشتنت پێوە بێ، لەکاری خوادا قسە ناکەیت، چونکە وتیان خۆ ئیتر هیچی تیا نامێنێ وئەبێ ئادەمیزاد پێی ڕەزامەند بێ[2].

لە دوا ساتەکانی ژیانیدا تووشی بەلاّو ناخۆشی زۆر بووە وبۆیە ڕەزا بووە بەقەدەرەی خوای گەورە.

## ٥) فەقر (الفقر):

«هەژاری» بریتیە لەنەبوونی شتی پێویست، «هەژاریی ڕاستەقینە» هەر گومکردنی دەوڵەمەندی نییە بەڵکو گومکردنی ئارەزووی دەوڵەمەندیشە[3]، ئەم زاراوە لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾﴿البقره: ٢٧٣﴾.

جارێك «حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشە» ئەچێ بۆ دیدەنی مەولەوی، مەولەوی هیچ لەماڵیا نابێ، ئەو ئێوارە بەقسەی خۆش وەخت ئەبەنە سەر تا خەو ئەیانباتەوە بەلادا، بۆ سبەی نیوەڕۆ هەندێ نانی «جۆ» و«دۆ» دێنن ودەس ئەکەن بە «نان وجۆ» خواردن، لەکاتی نان خواردنەکەدا «حاجی مەلا ئەحمەد» زۆر تەعریفی خواردنەکە ئەکات وبەشان وبالاّی خواردنەکەدا هەڵ ئەدات، مەولەویش ئەڵێ: میوانی وەك تۆ بەدەگمەن ڕێ ئەکەوێتە لای ئینسان، لەبەر ئەوە پێویستە بە لەززەترین خۆراکی بۆ دابنرێ!! دیارە بە نیسبەت کەسێکەوە هیچ شك نەبا «نان ودۆ» خۆراکێکی ئێجگار بەلەززەتە[4].

مەولەوی سەرەڕای ئەوەی کە خۆی فەقیر وهەژار ودەست کورت بووە وئەو هەژاریەشی پێ خۆش بووە وەك لەوەی کە ڕوو بکاتە کەس بۆ پێدانی ماڵی دنیا، وەك لە نمونەکانی پێشووە بۆمان دەرکەوتووە

---

(١) شعب الإيمان: أبي بكر أحمد بن الحسين البيهقي، (ب١/ل٢٢٨).

(٢) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٤١١.

(٣) التاج الجامع للاصول في احاديث الرسول: منصور علي ناصيف، دار الفكر-بەیرووت، چ٤، ١٩٧٥ز، (ب٥/ل١٧١).

(٤) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٢٠-٢١.

مەولەوی ئاخیرەتی دابووە بەسەر دنیادا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی خۆش نەبووە کەس هەژاری بچەژێت وەك دەڵێ:

پیری وفەقیری وکەسیفی، هەر سێ
نەبۆ وە هیجران باری هیچ کەسێ

واتە: یەخوا پیری و هەژاری وپیس وپۆخڵی نەبن بە باری منەتی سەرشانی هیچ کەس(1).

## ٦) فەنا وبەقاء (الفناء والبقاء):

«فەنا» واتە فەوتان وتیاچوون، خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ﴾ ﴿الرحمن: ٢٦﴾، وە «بەقا» دەبێتە مانەوە، ﴿وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ ﴿الأعلى: ١٧﴾.

«فەنا» بریتیە لەوەی ئایا بەندە لەسلوك وخۆپێگەیاندن وخۆ وەرزاندن ونەفس کوشتندا، تا چ ڕادەیکە زاڵ دەبێت بەسەر فەناکردن ولەناوبردنی هەستە ناپاك وناشایستە وناپەسەندەکانی دەروونی خۆیدا.

«بەقا»ش بریتیە لەوەی تا چ ڕادەیەك دەتوانێت هەستی چاك وپەسەند وباش بکاتە جێگرەوەی هەستە خراپەکان، فەرمان بەچاکە وڕێگری لەخراپە بکات(2).

«فەنا» بریتیە لە زانینی نەمانی چێژەکانی دنیا و«بەقا»ش بریتیە لە مانەوەی ئاخیرەت وبەردەوام هەوڵی بۆ بدات(3).

مەولەوی لە قەصیدەیەکدا باسی بینینی چاو دڵ ئەکات، کە بینینەکانی چاو فانین ونامێنن بەڵام بینینەکانی دڵ باقین وئەمێنن، وەك دەڵێ:

ئـێـد وەزیـفـەی گـڵ، ئەو لەتیفەی دڵ
ئەو چوون مەنزڵەن، ئێد بێچوون مەنزڵ

---

(1) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل١٤٤.

(2) تەصەووف چی یە؟: شێخ ئەمین علاءالدین نەقشبەندی، چوارچرا-سلێمانی، چ٣، ٢٠١٥ز، ل٢٥٤، و الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب١/ل١٧٠).

(3) تفسیر السلمي وهو حقائق التفسیر: أبو عبد الرحمن السلمي، التحقيق: سيد عمران، دار الكتب العلمية- بەیرووت، ١٤٢١ك-٢٠٠١ز، (ب٢/ل٢٩٤).

ئــەو بــەقــاش نــیــیــەن، فــەنــاش تاقییەن
ئــێــد عــەتــای تــاقــی و بــاقی و لاقییەن

واتە: ئیشی چاوی سەر بۆ ئەوەیە سەیری شتی مادی بکات، بەڵام ئەرکی سەرشانی چاوی دڵ ئەوەتە خەریکی کار وباری مەعنەوی ببێ، وەچاوی سەر جێگای شتی ماددی تیا ئەبێتەوە کە وێنەی ببێ، بەڵام چاوی دڵ جێگا ومەنزڵی خوای بێ وێنەیە، هەروەها چاوی سەر مانەوەی بۆ نیە وگومانی تیا نیە کە ئەفەوتێ، بەڵام چاوی دڵ بەخششێکی بەردەوام دار وبەخوا گەیشتووە[1].

مەبەستی مەولەوی لێرەدا ئەوەیە ئەوەی بۆ خوا بکرێت ئەمێنێتەوە وئەوەی بۆ دنیا بکرێت ئەڕوات ونامێنێتەوە.

مەولەوی لە قەصیدەیەکی تردا، وەك دەڵێ:

پووشەکەی هەستیم، گیاکەی پای چەم
وای نیستیی فــەنــا بــەردش پــەی عەدەم

واتە: لەشم کە وەك پووش وگیای ڕزیوی گوێی چەم وایە، بای لە فەنا وناوبردن هەڵی گرت وبردی بۆ جیهانی نەبوو[2].

مەولەوی لە قەصیدەیەکی تردا، باس لەوە ئەکات کە هیچ شتێکم نەماوە لە دنیا تاوەکوو بیبەمەوە بۆ حزووری خوا، تەنها کردووەکانم نەبێت، وەك دەڵێ:

هەر چیت دابوو پێم یەکیەك دامەوە
حــیــســابــی حــەشرت وا وەلامەوە

واتە: خوایە هەرچیت پێدابووم یەکە یەکە هەمووم دایتەوە، حسابی ڕۆژی حەشریشت بەسەرمەوەیە[3].

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل١٥٥.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٨.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨٨.

## باسی دووەم: حاڵەکان لای مەولەوی

بارێك وحاڵەتێکە تووشی ڕێبواری تەسەووف دەبێ، بەخششێکی خواییە ونە ئەبەخشرێت نە بەدەست ئەهێنرێت، بەپێچەوانەی مەقامەکانەوەیە کە دەست ئەخرێن بە هەوڵدان، «حاڵەکان» ماوەیان کەمە ونامێنن، بەلاّم «مەقامەکان» ماوە درێژن وئەمێنن[١]، «حاڵ» پەیوەندی بەوەرزی ڕۆحی ولەشیەوە نیە وجار وبار پەیدا دەبێ ودوای ون دەبێت، بەلاّم سۆفییەکان لەبارەی بەردەوامی حاڵەوە دوو ڕایان هەیە، بەڕای زۆربەی سۆفییەکان لەوانەش «جونەیدی بەغدادی» حاڵ بەردەوامی بۆ نییە، وەکو برووسکێ پەیدا دەبێ ودوای ون دەبێت، هەندێکیشیان لەوانەش «حارسی موحاسیبی» ڕایان وایە کە حاڵ بەردەوامی بۆ هەیە[٢].

لە هەندێ سەرچاوەدا «دە» حاڵ دەستنیشان کردووە کە ئەمانەن «المراقبة، القرب، المحبة، الخوف، الرجاء، الشوق، الأنس، الطمأنينة، المشاهدة، اليقين»[٣]، بەلاّم لە هەندێ سەرچاوەی تردا جگە لەمانەی پێشوو «قبض، وبسط، محو، اثبات، صحو، سكر، غيبة، شهود، وجد، جلال، جمال، كمال، لوائح، طوالع، لوامع، جذب وارد» دەستنیشان کراون[٤].

ئێستاش باسی مەقامەکان دەکەین لەلای مەولەوی، هەر یەکەیان چەند دێڕێکی لەسەر ئەنوسین، ئەوانیش:

### ٧) گیرانی دەروون وکرانەوەی دەروون (قبض وبسط):

«قبض وبسط»، دوو حاڵن لەو حالاّنەی کە دێنە ڕێگەی ڕێبوارانی تەسەووف، واتای ئەم دوو وشەیە لەڕوانگەی تەسەووفەوە، بریتیە لە گیرانی دەروون وەکرانەوەی دەروون، واتە قەبض ناڕەحەتی ونائارامی دڵتەنگییە، وە بەسط دڵکرانەوە وخۆشییە وە لە هەردووکیاندا مرۆڤ دەگاتە ئەو پەڕی خۆشی، یان ناخۆشی[٥]، خوای گەورە دەفەرموێت﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾﴿البقرة: ٢٤٥﴾.

---

(١) الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب١/ل١٥٤).

(٢) تأريخ تصوف در إسلام: قاسم غني، (ب١/ل٢١٢)

(٣) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٨٢-١٠٢.

(٤) تەصەووف چی یە؟: شێخ ئەمین علاءالدین نەقشبەندی، ل٢٨٣.

(٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٤.

قبض وبسط، كاتێكی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەو كات وسەردەمەیان لەسەرەتای دەستپێكردنی حاڵی «المحبة الخاصة» دایە، نەك لەپێش دەستپێكردنی حاڵی «المحبة الخاصة»دا بێت[1].

مەولەویش تووشی ئەم حاڵەتە بووە، ئەمەش لە قەصیدەیەكەوە بۆمان دەردەكەوێت كە مەولەوی لە دێی «تەوێڵە» دەبێت، زۆر بێ تاقەت ودڵ تەنگ ئەبێت، چونكە ویستوویەتی چاوی بە «شێخ سراجەددین» بكەوێ ومالاَّوایی لێ بكا و بگەڕێتەوە بەلاَّم بۆی ڕێ ناكەوێت، دەڵێ:

سەروەختی هەستی جە دەس وەردامەن
تەدارەكی خەیر ئارۆ و فەردامەن
تەمامەن بەرات قەبز و حەواڵەم
دێرەن كەرەم كەر بدەر پیاڵەم
تا هیممەت وازوو وە یەك پەیمانە
خاڵی بۆ چێمەیچ گۆشەی مەیخانە

واتە: وەختی لەدەست دانی بوونمە وخۆم ئامادەكردووە بۆ ڕۆشتنی یەكجاری و لەئەمڕۆ وسبەیدام، بەراتی خۆم بەتەواوی دەستگیر بووە، بەڕاستەوخۆ وبەوحەواڵە بۆ سەركار وهەر تەنیا پیاڵەی شەرابی مەرگم ماوە، درەنگە ئەویشم بدەرێ با بەنۆشكردنی داوای هیممەت وبەرەكەتتان لێ بكەم وبڕۆم وگۆشەی مەیخانەی جیهان منیشی تیا نەمێنێ[2].

### ٨) شەوق (الشوق):

دوای ئەوەی ڕێبوار لە حاڵی تكا كۆتایی دێ، ئینجا بەرەو حاڵێكی نوێ هەنگاو دەنێ ئەویش حاڵی «شەوق»ە، «شەوق» بریتیە لە جۆش سەندنی دەروون بۆ گەیشتنە خۆشەویست، فەرقی نێوان «شەوق» و«ئیشتیاق»دا ئەوەیە، «شەوق» پاش دیدار وچاو پێكەوتن دادەمركێت وەنامێنێ، بەلاَّم ئیشتیاق پاش دیدار وچاوپێكەوتنیش هەر بەردەوامە ودانامركێتەوە[3]، شەوق واتە «تاسەكردن»وە ئارەزووی دیدار[4].

(١) تەصەووف چی یە؟: شێخ ئەمین علاءالدین نەقشبەندی، ل٢٨٥.

(٢) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس، ل٥٢٢-٥٢٣.

(٣) الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب٢/ل٤٩٦).

(٤) تەصەووف چی یە؟: شێخ ئەمین علاءالدین نەقشبەندی، ل٢٩٢.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ﴾ ﴿العنكبوت: ٥﴾، هەروەها لە بارەی «شەوق»ەوە گوتوویانە: شەوق ئاگری خوایە ولە دڵی وەلییەکانی بەرداوە تاوکو هەموو ویست وئارەزوو وپێویستییەکانی بسووتێنێ[١].

مەولەوی لە قەصیدەیەکیدا کە بە بۆنەی دوور کەوتنەوەی «ئەحمەد بەگی کۆماسی»یەوە وتووەکە وا دیارە دوور خرابێتەوە بۆ ناوچەی «ڕەشت»و«گیلان»، ئەم حاڵەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ:

دیــــدە، وادەی سـەیـل هـۆنـەی هووناوەن
دڵـــە، وەخـــتی بـەزم نـۆشـای زوخـاوەن
وەش ڕەنـگـی بـازەم، سـادەی بـێـڕەنـگی
شادی با وەس بـۆ، وەخـتـەن دڵ تـەنـگی
وەشـی، وادەت شـی وەش ئامای وە خەیر
شەوقە، وە تەوق بای تاکەی هەوای سەیر

واتە: ئەی چاو ئێستا وادەی ئەوەیە لافاوی خوێن بڕێژی وئەی دڵ ئێستا وەختی ئەوەیە ئاهەنگی زووخاو خواردنەوە بگێڕی، ئەی شادمانی وادەت بەسەرچوو، خوا حافیزت بێ بەخێرهاتنی، تۆیش ئەی شەوق یاخوا تەوق بچێتە ملت تاکەی ئارەزووی تەماشاکردنت لەکەللە دەرناچێ[٢].

لە قەصیدەیەکی تردا مەولەوی وێنەیەکی زۆر جوان ئاماژە پێ دەکات و دەڵێ:

جـــە سـەردیـی مـۆبـەت ئـازیـزی بـێـگــەرد
جــۆی هـــوونـاوی دڵ جـە دیـدەم یەخ کەرد
دەسـتی بـێ ڕەحمـیـش دا نـە سـیـنــەی شەوق
گڕ وەردان نە جەرگ جەستەی هەستیی زەوق
زەهـــری خـەم شـیـیـەن نــــە کـامـی شادیم
هـــەر دەردەن مـــەیـــۆ مـــوبـــارەك بـــادیـم

(١) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٩٤.

(٢) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل١٧٢.

واتە: لەبەر ساردیی مەیلی خۆشەویستە بێ گەردەکەم جۆگەی خوێناوی گەرمی دڵم لەناو چاوەکانما مەیی وبوو بە سەهۆڵ، دەستی بێ ڕەحمی دا بە سەر سنگی شەوق وخۆشیما وبەو دەستە گڕی بەردا لەجگەری جەستەی قەوارەی زەوق وشادیم.

لەبەر بێ مەیلی یارەکەم ژاری خەم ومەینەت چووەتە ناو دەمی شەوق وشادیم وکارەساتێکم بەسەر هاتووە هەر دەرد وبەلاّیە دێت بۆ پیرۆزبایی لێکردنم[1].

مەولەوی لەم قەصیدانە وقەصیدەی تردا مەبەستی ئەویە لەتاو دووری و بێ مەیلی یار هیچ شەوقێکیشم نەماوە تاوەکو جارێکی تر ئومێدم پێ ببەخشێتەوە بۆ بینینەوەی خۆشەویستان، بۆ نمونە لەم قەصیدەیەدا زۆر بەجوانی باسی ئەوە ئەکات کە خەم وخەفەت چووتە ئەستۆی حالّی شەوقەوە، وەڵێ:

چـەمـان هەم قامەت کەیفم، خەمبارەن
زەردی نــە ڕووی دڵ زەوقــم دیـارەن
تەوقی خەم گەردەن شەوقەکەم بەستەن
کــەف پـای شادیم خار تێ شکەستەن
سـاقی، سا دەخیل جامی مەی وەکەف
دەروێش، ئامانەن کەفێ نە ڕووی دەف
خــۆ نــەوی فـرسەت جارێ نەجاران
هەر پۆس وە مشت بیم پەی دینی یاران

واتە: بالاّی کەیفم خەفەتبارە وزەردی بەسەر ڕووخساری دڵی زەوقمەوە دیارە، تەوقی خەم وخەفەت چووەتە ئەستۆی شەوقم، لەپی پێی خۆشیشم دڕکی تیا شکاوەتەوە.

دەخیلم ساقی کە پیاڵەی مەی ئەگێڕی، پیاڵەیەکمان بدەرێ، تۆیش ئەی دەروێش دەسێ بدە لە دەفەکەت وهەندێکمان بۆ لێدە، خۆ جارێکیان هەڵمان بۆ هەڵنەکەوت وهەمشە هەر لە ڕەنج کێشنا بووین بۆ دیتنی خۆشەویستان[2].

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل١٨١-١٨٢.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٦-٢١٧.

## ٩) ئونس یان خوو پێوەگرتن (انس):

«ئونس»، یەکێکی ترە لە حاڵەکانی تەسەووف، «ئونس» دەبێتە هۆگری بەشتێکەوە، وە دڵ کرانەوە بەو شتە، بێگومان لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە دڵی ڕێبواری ڕێگەی تەسەووف هۆگر دەبێ بە خۆشەویستی خواوە، مرۆڤ لەم حاڵەدا لەخەڵك بێزارە، تەنانەت ئەگەر بە جەستە لەناو کۆمەڵدا بێت ئەوا بەدڵ لای خوایە، لەم حاڵەدا ڕێبوار ناوبردنی خودای لە هەموو شتێ پێ خۆشترە، ئەم هۆگربوونە لای برێ لە خوا پێ داوان ئەگاتە ڕادەی «کەشف وشهوود»[1]، «ئونس» بریتیە لە متمانەکردن لەسەر خوا وهانا بردنە بەری وئارامگرتنە لە ئاستانەی خوادا[2].

هۆگربوون حاڵێکە لە «بسط»ەوە پەیدابووە، و«بەسط»یش واتە هیوا خواستنی شتێکە لەخۆشەویستەوە، کەوابوو «ئونس» شادمانی دڵە بە خۆشەویستییەوە[3].

مەولەوی لە قەصیدەیەکدا بۆ «شێخ سیراجەددینی تەوێڵە»ی نوسیووە، کە باسی ئەوە ئەکات کە هاودەمییەتی لە کۆڕی خۆشەویستی و خواپەرستی، وەك دەڵێ:

دەماخ وە نـەشـئـەی سەر بەرزان کەیل
مورشیدی میراو سەر جۆی بادەی لـەیل
ئـەنـیـسی مـەجـلـیس عەیش و نیشاتم
دەسـگـیـری ڕاگـەی هـات و نـەهاتم

واتە: ئەی کەسێ کە لووتت پڕ بووە لەبۆنی خۆشی پایە بەرزی بە خوا گەیشتن وئەی ڕێ پیشاندەرێ کە وەك مێراوی جۆگەی شەرابی خۆشەویستی وای، ئەی هاودەمی مەجلیسی خۆشیم، وە ئەی دەستگیرم لە ڕێگای هات ونەهاتدا[4]. مەولەوی لێرەدا مەبەستی ئەوەیە بە دانیشتن لەگەڵ شێخ ومورشیدەکەی وای لێ دەکات کە بچێتە حاڵی ئونسەوە وهەمیشە پێی خۆشە باسی خوا لەلایا بکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾﴿التوبه: ١١٩﴾.

(١) تەصەووف چی یە؟: شێخ ئەمین علاءالدین نەقشبەندی، ل٢٩٤.

(٢) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٩٦.

(٣) الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب١/ل١٥٦).

(٤) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل٣٠١.

## ١٠) قورب یان نزیکی (القرب):

ئەمەش یەکێکی ترە لەو حاڵانەی کە دێنە ڕێگای ڕێبوارانی تەسەووف، «قورب» ئەوەیە ڕێبوار بەدڵی نزیکی خوا ببینێ وبە پەرستنی لێی نزیك بێتەوە وهیوای هەر ئەوە بێ هەمیشە زیکری خوا بکا وخوای لە یاد بێ[(١)]،لە ئایەتەکانی قورئاندا «قورب» بە واتای نزیکی خوا لە بەندەی یا پەنابردنی بەندە بۆی هاتووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ﴾ ﴿البقرە: ١٨٦﴾.

مەولەوی لە «فوایح»ەکەیدا باسی خۆی دەکات لەبەر بارەگای خودادا و دەڵێ:

ز بحث خود چە عرضی را رسانم
چە سانم؟ از خسانم، نز کسانم
خودم را پرقصور ار مینخوانم
قصوری را ازان بدتر ندانم
خمیر از رد، ضمیر از بد نرفتم
ز تو یا رب وز خود در شگفتم
غنای مطلق از کل، باز در بند
(تعالی الله) زهی اعلی خداوند
بە آن محتاج وهر آن در معاصی
(معاذ الله) چ قاسیم و چ قاصی
ببخش ای (بوالعجب) این (بوالعجب) را
بیاموزش رموزات ادب را
نە تو یابی چو من ناپختە کاری
نە من یابم چوو تا ئاموزگاری[(٢)]

---

(١) کتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٨٤.

(٢) فوائد الفوائح شرح منظومة فوائح لعبدالرحیم مولوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، دار الحریە- بەغداد، ١٤١٦ك-١٩٩٥ز، ل١٠.

واتە:

دەربارەی خۆم چیت عەرزکەم کە چۆنم؟

چ جۆرم من؟ لە ڕیزی ناکەسانم نەك لە کەسانم!

ئەگەر من خۆم بە تاوانبار نەزانم

لەوە بەدتر چ تاوانێ بزانم

نەکارم لەهی بەد و، نە دەروونم

لە خدەی ناپەسەند پاك کردووەتەوە

خودایا من لە تۆ ولە خۆم سەرسام ماوم

لایەك موحتاجی کەس نیت و،

لایەك لە بەندی چاکە دای لەگەڵ خەڵکدا

چ خوایەکی بەرز وبالاٚی

بەو موحتاجم، لەگەڵ ئەوەشدا

سەرکەشم، نوقمی گێژاوی گوناهم

پەنا بەخوا چەند دڵ ڕەقم؟

پەنا بەخوا چەند لێی دوورم؟

هۆی سەرسامی! ببورە تۆ لەم سەرسامە

دروشمەکانی خووی پەسەندی فێربکە

نە تۆ وەك من ناپوختە کارێکت دەس دەکەوێ

نە منیش وەك تۆ مامۆستایەکم دەس دەکەوێ[1].

## ١١) خەوف وڕجاء (الخوف والرجاء):

ئەگەر دڵی ڕێبوار لە نزیکێتی خوادا گەورەیی وتوانایی ومەزنێتیی خوای بەدی کرد ئەوا دەکەوێتە حاڵی ترس وحەیا ولەرزینەوە، بەلاٚم ئەگەر چاوی دەروونی نەرم ونیانی وچاکە ودڵسۆزی خوای دی، ئەوا

---

(١) عقیدەی مرضیە: عەبدوڕەحیمی مەولەوی، لێکۆڵینەوە ولێکدانەوە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس،١٤٠٧ك- ١٩٨٨ز، ل١٦.

بەرەو حاڵی خۆشەویستی دەڕوا[(١)]، ڕێبواری سۆفیگەری کە تووشی حاڵی قورب دەبێ بەرە وحاڵی ترس وحاڵی خۆشەویستی دەبات، خوای گەورە دەفەرموێت﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ ﴾ ﴿الرحمن: ٤٦﴾، ترس پاشایەکە تەنها لە دڵێکی خوا ترسدا نیشتەجێ دەبێ[(٢)].

«خەوف وڕجاء» هەردوو باڵی کردەوەی ڕێبوارن، بێ ئەم دووانە ناتوانێ بفڕێ[(٣)]، ئەم زاراوەش لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا﴾ ﴿الكهف: ١١٠﴾، «خەوف وڕجاء» دوو زنجیرین پێکەوە ئەبنە هۆی ڕێگری لە خراپ بوونی ئەدەب[(٤)].

کاتێك چاو دەخشێنیت بە دیوانەکەی مەولەوی دا مەولەوی هەمیشە دڵی لەنێوان خەوف وڕجادا هێشتووەتەوە و داوای یارمەتی لەخوای گەورە کردووە کە یارمەتی بدات و لەو حاڵە ڕزگاری بکات، وەك دەڵێ:

نــە یــارای خــەیــاڵ وەســاڵی تۆمەن
نــە تــابــی دووری خــەیــاڵی تۆمەن
دڵ مــەندەن نە بەین خۆف و ڕجادا
مــەزانــۆ ڕاش کــام یــاوۆ ئــەو لادا
مــەرتــۆ وەکــەرەم تەشریف باوەری
یا وە لای وەسڵت ڕابەریش کەری
وەر نـــە، ئــازیزم، قەسەم وە نامەت
ســەرگــەردان مەبۆ تا ڕۆی قیامەت

واتە: نەفرسەتم هەیە بیر لەوەصڵت بکەمەوە، ونەتوانای ئەوەم هەیە دووربم لە خەیاڵکردنت، وە دڵم ماتڵ ماوە لەنێوانی ترسی نەگەیشتن بە تۆ وهیوای گەیشتندا، وە نازانێ ڕێگای ئەچێتە سەر کامیان،

---

(١) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٨٩.
(٢) الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب١/ل٢٥٣).
(٣) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، ل٩١.
(٤) الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري، (ب١/ل١٠٨).

مەگەر تۆبە بەکەرم ورێزی خۆتەوە ڕێگای پیشاندەی کەلەکوێوە ئەگاتە گەیشتن بە تۆ، ئەگینا گیانەکەم قەسەم بەناوت، دڵم تا ڕۆژی قیامەت بە سەرگەردانی ئەمێنێتەوە[1].

بەهەمان شێوەش لەم قەصیدەیەکدا کە بۆ «شێخ عەزیزی جانەوەری» نوسیوە، دڵی خۆی خستووەتە نێوان خەوف ورِجا وەدەڵێ:

دڵ وە تـــەمـامـی نـییەن نە جادا

خەریکەن نە بەین خۆف و ڕجادا

داخـــۆم بـە وەسـڵــێ لاونیمەوە

یـــا هـەر وە هـیجران تاونیمەوە

واتە: دڵم بەتەواوەتی لەجێی خۆیا نییە و خەریك ماوە لەنێون خەوف ورِجادا، نازانم ئاخۆ بەوەسڵی خۆت دڵم ئەدەیتەوە، یان هەر وەك جاران بەئاگری دووری ئەمتوێنیتەوە[2].

لەقەصیدەیەکی تردا مەولەوی دڵی خۆی ئەشوبهێنێ بە «کا»یەکی وەستاو لەنێون «خەوف ورِجا»دا، دەڵێ:

کای دڵم نە گێج مەوجی فەنادا

مۆڵەقەن نە بەین خۆف و ڕجادا

واتە: دڵەی وەك پوشم لەگێژاوی شەپۆلی لەناوچونا وەستاوە لەنێوان ترسی لەناوچوون وهیوای مانەوەدا[3].

لە قەصیدەیەکدا تردا لەگەڵ نەفسی خۆی قسەدەکات و دەڵێ:

ڕجات، گا بەی دیم، گا بەودیمەدا

هـا نـە گـەردەلوول بادی بیمەدا

واتە: ڕجای ڕەحمەتی خوات کەوتووەتە بەر گەردەلوولی بای ترس، وەك پووش تاوێك بەم دیوو وتاوێك بەودیوا ئەکەوی.

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٢٢٤.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧٢.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوتر، ل٥٥.

مەولەوی لەم شیعرەدا ئەوپەڕی وردی بەکار هێناوە چونکە مرۆڤ خۆی لە نێوان خەوف وڕجادا ئەبێ، بەلاّم ئەم هاتووە ڕجاکەی خستووەتە نێوان خەوف وڕجایەکی تر[1].

لە شیعرێکی تری دا تکا لە دڵ ئەکات کە ئیمانەکەی بپارێزێت و قەت بێ ئومێد نەبێت لەبەردەم بارەگانەی خوای گەورەدا ودەڵێ:

ستارەی ڕجات هەر دەم دارۆ سوو
دەماخ شاد، وە بۆی «و لا تیأسوا»

واتە: ئەستێرەی ڕجات هەموو کات تیشکی ببێت، هەمیشە لووتی دڵ شادی دەربڕێت بە بۆنی ئایەتی ﴿وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ﴾ ﴿یوسف: ٨٧﴾، واتە نائومێد مەبن لە بەزەیی ومیهرەبانی خوا[2].

مەولەوی لە شیعرێکی تری دا کە باسی وەرزعی پیری وچەمینەوە وتاوانەکانی خۆی دەکات، ودەڵێ تاوان ڕێگای ئومێدی لێ گرتووم، وەك دەڵێ:

تـاوان ڕای نەفەس ڕجا گرتەن لێم
کردە یاگەی دەس تەما ناستەن پێم

واتە: ئەی خوایە گوناح وتاوان ڕێگای لێ گرتووم هەناسە بدەم وتکات لابکەم، چونکە کردەوەی خراپ جێگەی دەستی هیوای پێ نەهێشتووم[3].

## ١٢) موراقەبە یاخود چاودێری (المراقبة):

«موراقەبە» بەحاڵەتێ دەگوترێ کە ڕێبوار هەمیشە بەدڵی خودا ببێنێ وئاگای لەکردەوەکانی ببێ، وە ئەم زاراوەیە لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا﴾ ﴿الأحزاب: ٥٢﴾، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:"أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٢٦٤.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٥.

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشووتر، ل١٥٩.

يراك"[1]، واته بەجۆرێك خواپەرستی بكەی وەك ئەوەی كە بیبینت، ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت.

مەولەوی لە شیعرەكەیدا موناجاتێكی پڕ مانا لەگەڵ خوای گەورەدا دەكات وخوای گەورە ئەكات بە ڕەقیب بەسەر كردەوەكانیەوە، دەڵێ تەنها تۆ بەكردەوەی خراپەم ئەزانیت و دەڵێ:

یـــا ڕەبـی نـەی شـەو تـاریـكـەی فانی
هـەر تـۆ وە كـــردەی بـەدیـــم مـزانـی
ئای سوبحی مەحشەر سەر ئەفگەندە وێم
شـــەرمندەی حوزوور خودا و بەندە وێم

واته: خوایە لەم تاریكە شەوەی دنیا فانیەدا هەر تۆ بە كردەوەی خراپم ئەزانیت وشارەزایت وڕەقیبت بەسەرمەوە، ئای سبەی لە ڕۆژی مەحشەردا لەتاو كردەوەی بەد وڕەشم سەرداخستووی حزووری لای تۆ و پێغەمبەر وبەندە چاكاكەكانت خۆم[2].

(١) صحيح البخاري: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، كتاب التفسير/ باب تفسير سورة آلم غلبت الروم/ ژمارەی فەرمووده ٤٤٩٩، (ب٤/ل١٧٩٣).

(٢) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس، ل٢٦٣.

## باسی سێیەم: مەی وساقی لای مەولەوی

«مەی» لەسەرجەم شیعری ڕۆژهەلاّتدا دیاردەیەکی باو بووە، شاعیرە سۆفیەکان ئەم بابەتەیان بە شێوەیەکی فراوان پەرەپێداوە ولەکۆڕی مەی ومەیخواردنەوە گەلێ ڕەمز ووێنەیان بۆ دەربڕینی بیری فەلسەفی خۆیان نەخشاندووە.

زۆر جار خوێنەر وتەنانەت هەندێ لە توێژەرەوەکانیش بە هەڵە لەم بابەتە گەیشتوون، هەرچەندە شاعیرە سۆفییەکان تامی مەییان نەکردووە، بەلاّم بەشێوەیەکی هونەریی زۆر بەرز ئەو کۆڕ ودانیشتنەیان لە شیعرەکانیاندا وێنەکێشاوە[١].

مەی: لە ئەدەبی سۆفیدا مانای خۆشەویستی خوا ئەگەیەنێ و ئەو مەستیە ئەبەخشێ بە سۆفی کە ئەنجامەکەی بێ ئاگاییەکی بۆ پەیدا ئەبێت وەك بلّێیت سەرخۆشییەکی بۆ دێ کە تیایدا بە بینین و گەیشتن بە خوا شاد ئەبێت.

ساقی: بریتیە لە پیرو مورشیدی ڕاستەقینە، وە ئەکرێ مەبەست لە شێخ بێت هەر وەك بە مانای خودا دێت لای سۆفیەکان ، واتە ئەوەی ڕێی خۆشەویستی خودا پیشانی سۆفی ئەدات وە ئەیخاتە سەر ئەو ڕێبازە جا ڕێنمویی شێخ بێت یان هیدایەت وبە هاناوە هاتنی سۆز و بەزەیی خودا[٢].

«مەی» لە زاراوەی شاعیر وعاریفە سۆفیەکانەوە بە واتای «گەیشتنە بەنهێنیەکان،یان ئەوانەی کە بەر دڵ دەکەون لەڕۆشنای بینین، وەهەروەها بەمانای عەشق وخۆشەویستی دێت، یان بریتیە لەمەقامی وەفا ئەمەکداری ڕاستەقینە»[٣].

مامۆستا «عبدالکریمی مودەڕڕیس» دەفەرموێت: "مەی واتە خۆشەویستی خواو هێمایە بۆ تەریقەتە"[٤].

---

(١) في التصوف الإسلامي وتأريخه: نيكلسون رينولد، نقله إلى العربية وعلقه: أبو العلاء عفيفي،قاهيره، چ١، ١٩٥٦ز، ل١٠٢.

(٢) وتارێك بە ناونیشانی (خوێندنەوەیەکی عیرفانی بۆ شیعرەکانی نالی) نوسینی: ژینۆ عەبدوڵلاّ-زاموا زاهیر، لەبەرواری (٣٠/نیسان/٢٠١٤) لە پێگەی (خاك تیڤی):
http://www.khaktv.net/all-detail.aspx?jimare=3338&type=komalayati .

(٣) حقيقة التصوف بين التأصيل والتأثير: بشير جلطي، دار الكتب العلمية-بەيرووت،٢٠١١ز، ل١٤٣.

(٤) دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و موحەممەدی مەلا کەریم، ل٢٤٩.

مەولەوی بابەتی مەی زۆر بەرفراوان کردووە وپەرەی پێداوە، لە «٥٦» غەزەلی مەولەویدا باسی «مەی» ووێنەی شیعری هەیە، زیاتریش هەر لەکۆتایی غەزەلەکانیدا پەنا بۆ مەی دەبات، هەندێ جاریش لەناوەڕاستی شیعرەکانیدا هانا بۆ ساقی دەبات.

بۆنمونە مەولەوی لەیەکەم پارچەی شیعرەکەیدا کە بە «ئیمشەو تەنیا بێ جەستەی زەبوونم» دەست پێ ئەکا وباسی خەم وپەژارەی خۆی دەکا وتا دەگاتە ئەوەی دەڵێ:

ڕۆ جە شەو فێشتەر، زار و زەلیلم
ساقی! سا جامێ، ئەمجار دەخیلم[1]

ئەمجار داوای مەی لە ساقی دەکات و دەڵێ:

بدەر پێم نۆش کەم چون هەردەجاران
وە ڕەغمی گردین گرۆی مەیخاران[2]

پاشان هەر لەهەمان قەصیدەدا داوا لەساقی دەکات فریای بکەوێت وبەڕووی نازەوە ئاوڕێکیش لەو بداتە، بەلاّم لێرەدە وەك بلێی داوای لە مورشیدەکەی بکات بۆ ئەوەی بەردەوام بە ئێواران وبەیانیان بەردەوام باسی خوای بۆ بکات، دەڵێ:

ساقی! سا دەخیل وە فریادم ڕەس
بە ڕووی نازەوە جام گێرە وە دەس
دەور دەرە وە ناز چون هەردەجاران
پێم دەر یەك مەنێ سەبا و ئێواران[3]

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٣١.
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشووتر، ل٣٢.

هەر لەکۆتای ئەم قەصیدەیەشدا داوا لە مورشیدەکەی ئەکات کە ئەوی بیر نەچێت و ودڵ خۆشی بکات دەڵێ:

سـاقـی! ئـامانەن، نەشوو جە ویرت
وە فریـادم ڕەس تـۆ بـەشقـی پـیرت
بەڵ ئیمشەو خـەمان نـەدەرۆم وە باد
ساقی گیان! قوربان، خاتر کەرە شاد[1]

دیارە مەولەوی پیاوی ساقی وساز ودەفی مەجازی نەبووە، شەراب خۆر وشەراب خوازیش نەبووە، بەتایبەت ساقی سوێند ئەدات بە عەشقی پیری، واتە مورشیدەکەی، بێگومان ئەم جۆرە شیعرانە چ لە عەرەبی وفارسیدا چ لەکوردیشدا، مەبەست پێی هەر شەرابی مەعنەوییە، وساقیش مورشیدە، و مەستیش هەمان حاڵی تەصەوفە[2].

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٣٢-٣٣.

(٢) تەصەووف چی یە؟: شێخ ئەمین علاءالدین نەقشبەندی، ل٤٦٥.

## باسی چوارەم: صلاواتدان و پێغەمبەر ﷺ

مەولەوی لە عقیدەی مرضیەدا باسێکی هەیە سەبارەت بە«صلاواتدان» لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەڵێ:

هەورەکەی ڕەحمەت ڕووی سەمای کەرەم
سەلات وسەلام کەی کەم ئێستە کەم
بێریّ و برێژیّ و بدا وەهەم دا
وەسەر مەرزەعەی ڕۆحی خاتەمدا
سەر واز کا سەراو وە هەر شەتاودا
وەسەر سەوزەی پاك و ئەسحاودا
تا بدا پرتە و وەسەر وجووددا
ئیمان لە ئەسرار ئەهل شهووددا[1]

واتە: یا خودا خوا لە ئاسمانی بەرزی کەرەم وبەخششی خۆیەوە ڕەحمەت وئیحسان بکا بە هەور وبارانی سەلاّت سەلام بێنیّ وبیدا بە یەکدا وبەدرێژیی کات بیڕژێنیّ وبیبارێنیّ بەسەر دێبەری خاوەن کەماڵی گیانی پاکی حەزرەتی سەروەری جیهاندا کە «محمد المصطفى» یەﷺ، ئەنجا ئاوی بەهێز وتاوی ئەو بارانە لە دێبەری گیانی پاکی حەزرەتی ڕەهبەرەوە تێپەڕ بکات وبدا بەسەر سەوزەی پاکی ئال ویارانی دا، هەتا تیشك ورووناکی بیر وباوەڕی جوان لە دڵ ودەروونی دەروون پاکانەوە بە گورجی بەسەر جیهاندا بلاّودەبێتەوە[2].

مەولەوی لە قەصیدەیەکدا لۆمەی خۆی دەکا وسامی ڕۆژی قیامەت ئەهێنێتە پێش چاوی خۆی بانگ ئەکات بۆ خواپەرستی وبەندەگی ڕاست، بۆیە مەولەویش زۆر ترسی ئەوەی هەیە پێغەمبەر ﷺ تووشی زەحمەت ببێت بە هۆی ئەمەوە، بۆیە دەڵێ:

جفتی مەعسیەت، جە تاعەت تاقم
ڕوو سیای مەجلیس جەرگەی عوشاقم

(١) عقیدەی مرضیە: عەبدوڕەحیمی مەولەوی، ل٢٨.

(٢) عقیدەی مرضیە: عەبدوڕەحیمی مەولەوی، ل٢٨-٢٩، هەڵبژاردەیەك لە عەقیدە مرضیەی مەولەوی: بابە علی شێخ عمر قەرەداغی، چاپخانەی ئیرشاد-بەغداد، ١٤٠٥ك-١٩٨٥ز، ل٣٣-٣٤.

بیـنـای وجـوودم خەجڵەت ئەساسەن
بـەخـتـم مـوخـالـیف، نامەدیم ڕاسەن
سـەبـای هەناسەم نە دەروون سەد تەرز
کـەردەن کـڵـپـەی نـار ئیبراهیمی بەرز
پەنجـەت بـەو نـەغـمەی بـین وە تینەوە
بـاوەرە ئـەی بـەیـت وە حـەزیـنـەوە:
سەهلـەن من ڕوو زەرد سەر نە وەرەنان
ئـای مـایـەی تـەسـدیـع پـەیغەمەرەنان[1]

واتە: لەگەڵ تاوانا بووم بە هاوجووت وتاك كەوتووم لە خوا پەرەستی و ڕووڕەشی كۆڕی ئەنجومەنی دڵداران بووم، وە بنچینەی بوونم لەسەر خەجاڵەتی دامەزراوە وبەختم یار نییە ونەگبەتیمە.

هەناسە وەك بای سەبا بە تەوژمم بەهەزار جۆر كڵپەی ئاگری بەتینی دەروونمی بەرزكردەوە، كاكی نەیچی پەنجە بخەرە سەر نەیەكەت ودەمی پێوە نێ و بەئاوازە بەرز وبەهێزەكەت بە خەفەتبارییەوە ئەم شیعرەم بۆ بڵێ.

قەیدی نیە من خۆم ڕوو زەردم و سەرم دانەواندووە، بەڵاَم ئاخ! بووم بە مایەیی زەحمەت كێشانی پێغەمبەرﷺ[2].

لە شعرێكدا باسی ڕوو زەردی خۆی دەكات ودەڵێ:

مـەدیـە وە تـۆمار كردەی ویەردەم
بدیە وە زەردیی ڕوخسار ئاوەردەم

داوا لە خوای گەورە دەكات ودەڵێ: مەڕوانە بۆ تۆماری كردەوەی ڕابردووم، سەیری ئەو شەرمەزاری وزەردییە بكە كە بەڕوومەوەیە[3].

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولكەریمی مودەڕڕیس، ل٢٥٠.
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥١.
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشووتر، ل٩٣.

## باسی پێنجەم: ئیسرا ومیعراجی پێغەمبەر ﷺ

**مەبەست بە «ئیسرا»شەوڕەوی: ئەو گەشتەیە کە خوا ڕێزی بێ پایانی پێ لە پێغەمبەری خۆی گرت ولە مەسجدولحرامەوە لە مەککە بەسواری بوراق لەشەوێکدا بردی بۆ مەسجدولئەقصا لە قودس.**

**مەبەست بە «میعراج» بەرزکردنەوەی پێغەمبەرە لە مەسجدولئەقصاوە بۆ ئاسمانەکان وگەیاندنی بە شوێنێك زانستی مەخلوقات «مەلائیکە وئادەمیزاد وجنۆکە»پەی پێ نابات ونایگاتێ[1].**

**سەبارەت بە کاتی ڕوودانی ئەم موعجیزە گەورەیە بۆچوونی جیاواز هەیە، بەلاّم ڕای پەسەند ئەوەیە کە، لە «٢٧»ی مانگی «ڕەجەب»ی سالّی «١٠» پێغەمبەرێتیدا بووە[2].**

**خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەم ڕووداوە گرنگە پڕ ئیعجاز بەخشەمان بۆ ئەکات وئەفەرموێت** ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ **﴿الإسراء: ١﴾.**

**مەولەوی شاعیر بەشێوەیەکی زۆر جوان باسی ئیسرا ومیعراجەکەی پێغەمبەر ﷺ دەکات و دەڵێ:**

**فەلەك نەقشی پێی دی لە زەمیندا**
**خوێی گرینی هات وە ڕووی بریندا**
**چاوگەی چاوەکەی لێلّ و حەسرەت مەند**
**(لَيْتَنِي كُنْتُ تُرَاباً)ی دەخوێند**
**هەرچی ڕیفعەت وعیزز و هەستی وێ**
**فیدای نەبوونی و خواری و پەستی وێ**
**حەق ڕەحمی ئاورد بەو سۆز و تاودا**
**دەقیقی پەردەی لابرد لە ناودا**
**سورمەی گەردی پێی کێشا وە چاودا**

---

(١) فیقهی سیرەی پێغەمبەر: محمد سعید ڕەمەزان بوتی، وەرگێرانی: مەلا مەحموودی گەلاّڵەیی، الهدایە-هەولێر، چ١، ٢٠١١ز، ل٢٣٤.

(٢) گولاّوی سەرمۆر: صفی الرحمن المبارکفوی، وەرگێرانی: بکر حمە صدیق عارف، احسان-تاران، چ١، ٢٠٠٣ز، ل١٦٠.

بەو چاوی پڕ ئێش دووری و بـیٚ خاودا
ئێشی چاوی چوو نەختیٚ پڕ خـــەوو بوو
لە حیکمەت میعراج ئەو یەکیٚ ئـەو بوو[(١)]

واتە: زەوی لەبەر ئەوەی خۆی بەکەم زانی ومل کەچ و بارەبەر بوو خودای گەورە سەربەرزی کرد، کردی بەشوێنی پەیدابوون وبناغەی دەرکەوتنی ڕەهبەران، بەلاٌم ئاسمان کە بەرز بوو، خۆی بە بالاٌ وزل دەزانی، بیٚ بەش بوو، هەتا جارێك ئەم ئاسمانە بەرزە سەیری نەخش وشوێن پێی حەزرەتی پێغەمبەری کرد وبەزەیی بە خۆیدا هاتەوە ودەستی کرد بەگریان وفرمێسکی سوێری بەسەر برین وهۆی گرینەکەیدا کە زەوییە ڕشت و، هەموو جار دەیگوت: خۆزگا منیش خاك بوومایە، نزم بوومایە! هەرچی بەرزی وگەورەیی وپایە ومایە هەیە بەقوربانی پەستی خاکینەیی بێت.

بەڵیٚ کە ئاسمان گریا وبەسۆز فرمێسکی ڕشت، خودای گەورە ڕەحمی پیٚ کرد وپەردەی حیجابی لەناوا لابرد، حەزرەتی لەشەوی میعراجدا سەرخست بۆ ئاسمان وئاسمان تۆزی پێی حەزرەتی لەباتی کل وسوورمە هێنا بە چاوانیا کە پڕبوون لەژانی دووری وبیٚ خەوی، بەو بەیەك گەیشتنە ئازاری چاوەکانی لاچوو، خەوی لیٚ کەوت و حەسایەوە، وئەم میعراجە دڵدانەوەی ئاسمان وشادکردنی بە دیداری حەزرەتی پێغەمبەریشی تیابوو[(٢)].

دواتر مەولەوی باسی هاوکێشەیەکی ورد دەکات بۆمان سەبارەت بە بینین وناسینی خوای گەورە لەلایەن حەرزەتەوە، ودەڵیٚ:

ئومووری قودسی لـە دڵ دەدەن سەر
(ثـــم تـنـتـقـل مـنـــه للـبـصـــر
بـــل لـسائر الحـــس والـقـــوی
بـــل لـعـالم الخـلــق والـســوِی)
بە هەر وەجهیٚ دڵ عیرفانی پێی بوو

(١) عقیدەی مرضیە: عەبدوڕەحیمی مەولەوی، ل٣٤٧.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٨.

بەو ڕووو بۆ بەسەر ڕوئیەتی دای ڕوو
بـەسـیرەت نـاسی، بەسارەت بینی
دڵ بێنـی درۆی نـــەدا لـــە بینـی[1]

واتە: کاروباری قودسی، ئەو حاڵەی پەیوەندی بە غەیبەوە هەبێ وئینسان تیایا بەشدار بێت، یەکەم جار دەچێتە دڵەوە و، لەوێوە سەرهەڵدەدات، پاشان لەوەێوە دەچێت بۆ چاو وئەندامەکانی تری هەست، بۆیە بە هەر جۆرێ کە دڵی حەزرەت لەشەوی میعراجدا خودای گەورەی ناسی چاویشی هەر بەو جۆرە خودای بینی، واتە یەکەم جار بەسیرەتی دڵی حەزرەت ﷺ خودای ناسی و، دووەم جار بینایی چاو زاتی خوای گەورەی بینی، ئیتر هەرگیز دڵ چاوی حەزرەتی نەخستەوە بە درۆوە، نەیوت نەتدیوە، بەڵکو باوەڕی پێ کرد، وتی ڕاست دەکەیت، چونکە دڵ و چاو وحەواسەکانی تر بەجارێك باوەڕ بەڕاستی دەکەن[2].

بەڵێ هێزی ناسینی دڵ ناسیی وهێزی بینینی وڕووداوەکە هێندە ڕوون وئاشکرا بوو، هەرگیز بۆنی بەدرۆخستنەوەی نە ئەهاتە لووتی دڵ وبەتەواوەتی دانی بەوەدا ئەنا کە بینراو وناسراوەکەی یەکە[3]، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ﴾ ﴿النجم: ١١﴾.

دواتر مەولەوی دێتە سەر باسی چۆنێتی بەرزبوونەوەکەی پێغەمبەر ﷺ کە بەشێوەیەکی زۆر جوان وبە ڕەوانبێژییەکی زۆر ورد وبەرز ئەیرازێنێتەوە و دەڵێ:

ڕێـــی چـەنـد هـەزار ساڵ، تـەی چەنـد حـیجابات
زاتـــی حـــەق، کـــەلام، ســـوئـــاڵ، جـەوابـات
چـــوو، بـــوو، دیـــی، بـیـستـی، کـــریـا، دریـــاوە
هـــاتـــەوە وحـــەڵـــقـــە هـــــەر دەلـــەریـــاوە
هەی تەل! هەی تێی گەی؟! پێی گەی؟! هەی نەیخۆی
وەك مـــاری زامـــدار هـــەر پـێـچ دا لـــە خـــۆی!

(١) عقیدەی مرضیە: عەبدوڕەحیمی مەولەوی، ل٣٥٤.
(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٧.
(٣) هەڵبژاردەیەك لە عەقیدە مرضیەی مەولەوی: بابە علی شێخ عمر قەرەداغی، ل٩٣.

فــەرقــیان، هـــەی فـــام ئـــەبـنـای زەمـــانـــە!
هـــەر لـــە ســـەرزەمـــین تـــا ئـــاســـمـــانـــە[1]

واتە: حەزرەت ﷺ لە شەوی میعراجدا ڕێی چەند هەزار ساڵ «چوو»، چەند حیجابات تەی «بوو»، زاتی حەقی «دی»، کەلامی خودای بیست.

پرسیار وسوئال لەلایەن خواوە لە حەزرەت «کرا»، جەوابات لەلایەن حەزرەتەوە «درياوە»، پاش ئەمانە حەزرەت ﷺ لە ژووری عەرشەوە هاتەوە بۆ شاری مەککە و هێشتا ئەڵقەی زنجیری دەرگای ماڵی «أم هانيء»ی پووری، کە لەوێوە ڕۆیشتبوو، هەر دەلەرییەوە.

پاش بەیانی ڕووداوی شەوی میعراج بانگ لە تەلی تەلەگراف ئەکات ودەڵێت: هەی تەل نەخەڵەتابیت وابزانیت دەتوانی وەك ئەوەی شەوی میعراج دەنگ وباس وەربگری وبیدەی، نەتێی دەگەیت ونە پێی ئەگەیت، هەی لەززەت وخۆشیی ئەو پایە ومایە نەخۆی، تۆ لەکوێ وئەو لەکوێ؟! دەلێی گەڕێن با ئەو تەلە وەك ماری زامدار پێچ لەخۆی بدا وبەدەوری خۆیەوە بتلێتەوە[2].

ئەنجا ڕوو دەکاتە هاوچەرخانی خۆی ودەڵێت: ئەی کوڕانی ڕۆژ، ئەی خاوەن فامان! فەرق وجیاوازی نێوان چوون وهاتنەوەی شەوی میعراج لەگەڵ گەیشتنی دەنگ وباس وقسە بە تەلەگراف وەك فەرق وجیاوازی مابەین ونێوانی عەرز وئاسمانە[3].

سەعیدی نوورسی هەر لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەم گەشتە جوزئی‌یەی میعراج هێندە گەشت وگوزار و ڕۆشتنی گشتی وبەرزبوونەوەی کوللیی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی بەرزبوونەوە و دەمی بڕینی پلە هەمەکی‌یەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورەدا، کە تا «سدره المنتهى» و«قاب قوسين أو أدنـى» دەگرنەوە، هەموو نیشانە و بەڵگە پەروەردگاری‌یەکان و گشت ئەو کارە ناوازانەی سنعەتی خواوەندی بیستووە و بینیوە کە لەو گەشتەدا بەرچاو و گوێی کەوتوون[4].

---

(١) عقیدەی مرضیە: عەبدوڕەحیمی مەولەوی، ل٣٥٧.

(٢) مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس دەفەرموێت: لەوانەیە مەولەوی تەلەفۆنی دیبێ کە لاستیکەکەی پێچاوپێچە.

(٣) عقیدەی مرضیە: عەبدوڕەحیمی مەولەوی، ل٣٥٨، هەڵبژاردەیەك لە عەقیدە مرضیەی مەولەوی: بابە علی شێخ عمر قەرەداغی، ل٩٦.

(٤) وتەکان: بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، وەرگێڕانی: فاررووق ڕەسووڵ یەحیا، مهارات-تاران، چ٢، ١٤٢٧ك-٢٠٠٦ز، ل٨٣٨.

# باسی شەشەم: مرۆڤ دۆستی ولێبووردەیی مەولەوی

## ١) مرۆڤ دۆستی:

یەکێك لە لایەنە هەر گرنگەکانی مەولەوی ئەوە بوو کە دۆستی هەبووە ولەم دۆستایەتیەدا نامەی شیعری هەبووە لەنێوانیاندا، یەکێك لەو قەصیدە پڕ سۆزانەی کە مەولەوی لەسەردەمی فەقێیەتیدا بۆ «شێخ عەزیزی جانەوەریی» هاوڕێی نووسوە کە لێی جیا بووەتەوە وچووە بۆ «بانە»[(١)] دەڵێ:

### بە «هەورامی»

ئازیز! دیارەن، وادەی لوامەن
ئەلوەدای ئاخر ئەوەنامامەن
دەوڵەتەکەی وەسڵ پا نە زەواڵەن
جارێوتەر دیدەن باڵات مەحاڵەن
سا دڵم وەش کەر وە ئیلتیفاتێ
بدیە وە لاوە، بوینووت ساتێ
با بەیۆ شنۆی شیرین ڕازەکەت
گۆش دەرۆ لادێ مەینەت گازەکەت
ئاخر سەفەرەن، ڕا خەیلێ دوورەن
مەنزڵ بێ پایان تۆشە زەروورەن
دینت تۆشەی چەم، مەیلت تۆشەی دڵ
ڕازت تۆشەی گۆش، مەنزڵ وە مەنزڵ
کێ زانۆ چۆن بۆ ئەی دنیای فانی؟
با ببۆ نە بەین گەردن ئازادی!
مەن شەوێ ناڵەم جۆش ئاوەردەبۆ
سەگی ئاسانەت بێدار کەردە بۆ

### بە «سۆرانی»

ئازیز! دیارە کۆچی دوایمە
ئالۆدای پێچی ماڵ ئاوایمە
دەوڵەتەکەی وەصڵ، پێ لەزەواڵە
دیدەنی باڵات ئیتر مەحاڵە
سا دڵم خۆشکە بە إلتفاتێ
وەرە بەم لاوە بت بینم ساتێ
با بێتە بەرگوێم شنۆی ڕازەکەت
گوم نەبێ لە چاو شێوەی نازەکەت
ئاخر سەفەرە ڕێگا زۆر دوورە
مەنزڵ بێ پایان تۆشوو زەروورە
دینت:تویێشووی چاو، مەیلت تویێشووی دڵ
ڕازت: تویێشووی گوێ مەنزڵ بە مەنزڵ
دەوران دەور ئەمدا بۆ نامرادی
با، لە بەینا بێ گەردن ئازادی
شەوێ ناڵەی من جۆشی سەندبێ
سەگی دەرگاکەی تۆی هەڵسەندبێ

---

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل١٤٤.

یا ناستەبۆ سەیل دیدەم، نەفەسێ
نەسیم گەرد پات بەرۆ پەی کەسێ
جەمینت زەحمەت نیگام کێشابۆ
کەفی پات وە خار دیدەم ئێشابۆ
یا کەردەبۆ دڵ دێوانەی دڵ تەنگ
وەختی نیشانەی دڵان پەی خەدەنگ
پەلەپەل پەی زەوق زامێ وە تیرت
ئازار دابۆ تای زوڵفی زنجیرت
یا خۆ تۆ دابۆت وە دڵ مەزەی مەرگ
تیری خەدەنگت دابۆ نەتۆی جەرگ
یا مەڕدەبۆت دڵ دێوانەی دڵگیر
جە تیرئەندازی کەردەبۆت تەقسیر
یا نەدابۆت تۆز گەردی پاڵاکەت
پەرێ سورمەی چەم سفتەی باڵاکەت
تۆ بویەر جە من، من زوو ویەردم
هیممەت بۆ، ها ژار مەحروومیت وەردم
چەپگەرد پەی دووریت شانا مۆرەی نەرد
وە زاهر «بانە»ش وە بەهانە کەرد
تا فەلەك پەیمان نە بەهانە بۆ
ئەر سەد بانە بۆ، باز شوکرانە بۆ
ئەر فرسەتش دا پەی دڵ خەمینت
عومرێ دووبارەن جارێوتەر دینت

یا نەی هێشتبێ ئەشکی تەڕی من
شەماڵ تۆزی ڕێت بەرێ بۆ دوژمن
یاخو نیگای من ڕووی ڕووشاندبی
دڕکی بڕژانگم پێی ئێشاندبی
یاخو دڵەکەی دێوانەی دڵ تەنگ
وەختی نیشانەی دڵان بۆ خەدەنگ
لە پەلەی خۆشی نیشانەی تیرت
ڕای کێشابێ تای، زوڵفی زنجیرت
یا تۆ دابێت، بەدڵ مەزەی مەرگ
ڕەنگە خەدەنگت دابێ لەتوێی جەرگ
یا بەننە بە دڵ دێوانەی دڵ گیر
لە تیر ئەندازیت کردبێ تەقصیر
یانەت ناردبێ تۆزی پێڵاوت
بۆ کلی چاوی کوێری پێناوت
تۆ لێم ببورە من زوو لێت بوردووم
چونکە بەژاری پەژارەت مردووم
چەپ گەرد ئارەزووی بە دووریمانە
بە دیمەن بانەی کرد بە بەهانە
تا فەلەك لێمان بە بەهانە بێ
هانە هانەکەی با هەر بانە بێ
خۆ ئەگەر بیلێ بۆ دڵ غەمینت
عومرێکی نوێیە دووبارە دینت

| | |
|---|---|
| وەر نـاسـتـش، ئـازیز! تـۆ وە سڵامەت | ئـەگـەر نـەیش هێڵێ تۆ بەسەلامەت |
| دیـدەنـی دیـدار کـەوت ئـەو قیـامەت! [1] | دیـــدەنـــی دیـــدار کـەوتـە قیامەت[2] |

ئەم قەصیدەی مەولەوییە پڕە لە هەستی مرۆڤ دۆستی و تەوازووعی مەولەوی بەرامبەر بە «شێخ عەزیزی جانەوەریی».

## ٢) لێبوردەی مەولەوی:

مەولەوی جارێك لەگەڵ کەسێکدا بەنیازی حەجەوە لە «سەرشاتە»وە بەرێ ئەکەون تا ئەچنە بەغدا وئەچنە تەکیەی «شێخ عەبدوالقادری گەیلانی»، لەوێ مەولەوی نەخۆش ئەکەوێت وئەکەوێتە حاڵی خۆیەوە، پیاوەکە کە ئەزانێت تازە مەولەوی رزگار بوونی نیە، هەڵدەستێت هەرچ پارەیەکی پێ ئەبێ لەباخەڵی دەری دێنێت، وپێی لێ ئەکاتە کەوشاو بەرەو ماڵ! مەولەویش لەوێ لە گیانەلادایە.

کە دێتەوە هەر لە دوورەوە خۆیی ئەنێتە قورِ ودەست ئەکات بە «باوە مەولەویم رۆ» کردن وئەڵێ: «باوە مەولەویم لە بەغدا نەخۆش کەوت ومرد، خۆیشم ناشتم وپارەی حەجەکەشم بۆ کرد بەخێرات».

ماڵی مەولەویش ئەکەونە شین وشەپۆڕ وگریان، لەپرسە ئەبنەوە ودوو مانگێکی پێ ئەچێ، مەولەوی نامرێ، بەلاّم پارەی پێ نەماوە، پەکی حەجەکەی ئەخات وئەگەڕێتەوە.

رۆژێ خۆی ئەکات بەمالاّ! کابرا شکە ئەمە ئەزانێت هەڵدێت وئەداتە کێو، کوڕەکانی مەولەوی دەستی لێ ئەدەنە تفەنگ، مەولەوی ئەڵێ: دەستی لێ مەدەن، هەرچی بووە، بووە. خۆ من وا هاتمەوە.

کە کابرا ئەگرن وئەیهێننە بەردەم مەولەوی، مەولەوی لەجیاتی ئەوەی لۆمە وسەرزەنشتی کابرا بکا پێی ئەڵێ بەخوا قەسەم بمزانیایە هاتوویتەوە بۆ ئێرە، تا تۆ لەم ولاّتەدا بوایەی پێم تێ نەئەنا بۆ ئەوەی شەرمەزار نەبی!، برا! خوا رووی مردن ڕەش کاو ا تۆی شەرمەزاری لای من کرد، ئەگەر من بمردمایە تۆ بۆچ ئەم خەجاڵەتیەت بەسەر ئەهات؟! لە پاشا بەرەلاّی ئەکەن[3].

(١) دیوانی مەولەوی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ل٣٣-٣٧.

(٢) رۆحی مەولەوی: پیرەمێرد، ل٢٨-٢٩-٣٠

(٣) یادی مەردان: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، (ب٢/ل٣٧٤)، ومیهرەجانی مەولەوی، ل١٦٩-١٧٠.

# کۆتایی

تەسەووف بابەتێکی دێرینی چڕو بەیەکا چووە، سەرەتاکانی بۆ پەیدابوونی ژیان دەگەڕێتەوە لەسەر ئەم زەوییەدا، وەنەبێ تەنیا بەئیسلامەوە بەند بێ ولەوەوە ڕێچکۆڵەی کردبێ، بەڵکو دارێکی هێندە بەناخا چووی ژیانە ڕەگ وڕیشۆڵەکانی گەلێ شوێنی گرتۆتەوە بە تایبەتی لەناو ئەو گەلانەی کە خاوەن ژیاری کۆنن.

هاوەڵاٌن وشوێنکەوتووان ئەگەر چی بانگ نەکرابن بە «سۆفی»، بەلاٌم لەهەمان کاتدا سۆفی بوون، ئایا مەبەست لە تەسەووف لەوە زیاتر چی یە کە مرۆڤ بۆ خوای گەورە بژی نەك بۆ نەفسی خۆی؟! وە خۆی بڕازێنێتەوە بە دنیا نەویستی وپابەندبوون بە پەرستشەکانی و بەگیان وبە دڵ لە هەموو کات وسات وبارێکدا ڕووبکەنە دەرگانەی خوای گەورە، هاوەڵاٌن وشوێن کەوتووان تەنها بەدان پێدانانیان بە بیروباوەڕ وهەستان بەهەموو فەرمان پێکراوەکانی ئیسلام نەوەستاون، بەڵکو هەوڵیان داوە چێژ ببینن لەو بەندایەتییەی کە بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورە دەیکەن، سەرەڕای پەرستشە فەرمان پێکراوەکان هەستاون بە ئەنجامدانی ئەو پەرستشانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی ویستوون و ئەنجامی داوون. پاشان دوورکەوتوونەتەوە لە هەموو بێزراوەکان «المکروهات» وپێشیان خستووە بەسەر کارە یاساغەکان «المحرمات»دا، هەتاوەکو بینابیان ڕۆشن بوویەوە و، بەمەش کانی دانایی وحیکمەتیان لە دڵەکانیاندا تەقییەوە، دەرئەنجام ئەو سێ سەردەمەی هاوەڵاٌن وشوێن کەوتوان وشوێنکەوتەی شوێن کەوتووان بە شێوەیەکی گشتی بوون بە باشترین وڕازاوەترین وبەختەوەرترین سەردەمەکانی ئیسلام.

تەسەووف لە بناغەدا بیروباوەڕێکی ئایینییە وئامانجی شکاندن وشتنی نەفس و ئارەزووی مرۆڤ وپاك کردنەوەی گیانی ئادەمیزادە لەچڵك وپەڵەی دنیا پەرستی وپوولەکێتی وبەو چاوە سەیری ژیان وسروشت ئەکات کە هەموولایەکی گرتووەتەوە وجیهانێکی پڕ لەخۆشەویستی ڕاستەقینە وڕیبازێکی گیانی بەگیانی دوور لە ماددەپەرستی بەدەوری خۆیا دروست کردووە کە پڕ بێ لە کەڵکەڵە وخەیاڵی ناسك وهەستی پیرۆز کە دڵسۆزی وڕاستگۆیی و جگەر سۆزی لێ هەڵقوڵێت.

تەسەووف کورەبییەکە خاك دەکاتە زێڕ، خام وکاڵ لە کوورەی حەقیقەتدا قاڵ ئەکا دەیکاتە گەوهەر، نەزان زانا دەکات، ڕێبوار دەکاتە ڕێبواری ڕێگەی حەق، پاشان دەیخاتە سەر ڕێگای خواناسی

تەسەووف لە شیعرەکانی مەولەوی و زۆرێك لەبەرهەمەکانی باڵی بەسەردا کێشاوە، مەولەوی پابەندی شێخەکانی نەقشبەندی دەبێت وهەتا دێت لە شێخەکانی تەوێڵە نزیك دەبێتەوە ولەبەر ئەمە کاریگەری ئەمانە زیاتر ڕایکێشاوە بۆ کۆڕی سۆفێتی وتاوای لێهاتووە ببێت بەسۆفییەکی بەناوبانگ، مەولەوی بەمە نەوەستاوە پشتی بەپیری تەریقەتەکانەوە ببەستێت، بەڵکو هەنگاوی ناوە بەرەو ژورەوە وتا گەیشتووەتە مەیدانی وجود وفەلسەفەی بەخودا پەرموون، کە بتوانیٚ ڕازی خۆی لەگەڵ خوای خۆیدا بەبیٚ پەردە دەربڕێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە مەولەوی چاك لە تەسەووف گەیشتووە و ڕۆچووە، ئەمانەش دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە مەولەوی شارەزا وبەتوانا بووە لە زانستی کەلام و عەقیدەداو چەن کتێبێکی لەدوای خۆی بەجیٚ هێشتووە.

مەولەوی زۆربەی بەیتە سۆفیگەرییەکانی بەرەو خۆشەویستی خوایی هەنگاو دەنێن، لە هەندیٚ بەیتیدا حاڵ ومەقەمەکانی خۆی دەردەبڕێت.

هەروەها مەولەی کتێبێکی دوورو درێژی هەیە بەناوی «عەقیدەی مەرضیە»، تێیدا باس لە قوڵبوونەوە وسەرنجدان دەکات وئەوە پیشان دەدات کە ئادەمیزاد چۆن خوا بناسێت. مەولەوی جگە لەو بەرهەمە لە هۆنراوەکانیدا زاراوەکانی سۆفیگەری بەکار هێناوە، هەروەها لەزۆر شوێنی تردا بەپێی موناسەبەت باسو مەقامەکانی حاڵی هێناوەتە ناوەوە وەك وشەی «جەمال، جەلال ، خەوف، ڕەجا، مەی، عیشق، بادە....هتد» ئەمانە هەمووی زاراوەی سۆفیگەرین.

# سەرچاوەکان

پاش قورئانی پیرۆز.

- **سەرچاوە کوردییەکان**


١) بارانی سلێمانی (بەرهەمی بلاّونەکراوە ولەیادکراوەی محمد سالّح دیلان): ئومێد ئاشنا، بلاّوکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠١ز.

٢) بنەماڵەی زانیاران: مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ناوەندی بلاّوکردنەوە: کتێبی کانی-سنە، پەخشانگای ئاننا، چ١.

٣) بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد: محەمەد عەلی قەرداغی، بلاّوکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠٤ز.

٤) تەصەووف چی یە؟: شێخ ئەمین علاءالدین نەقشبەندی، چوارچرا-سلێمانی، چ٣، ٢٠١٥ز.

٥) پیرەمێرد وپێداچوونەوەیەکی نوێی ژیان وبەرهەمەکانی: ئومێد ئاشنا، بلاّوکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠١ز.

٦) دیوانی کاکەی فەلاح: بنەماڵەی شاعیر، ٢٠٠٤ز.

٧) دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس وموحەممەدی مەلا کەریم، چاپخانەی انتشارات کردستان-سنه، چ٦، ١٣٨٩هەتاوی.

٨) دیوانی مەولەوی لەهەورامی بۆ سۆرانی: محەممەد ئەمینی ئەردەلاّنی، بلاّوکراوەی ئیحسان-تاران، چ١، ٢٠٠٩ز.

٩) دیوانی مەولەوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، دەزگای ئارا-سلێمانی، چ١، ٢٠١٥ز.

١٠) دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە ولەسەر نوسینی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، بلاّوکردنەوەی کوردستان-سنە، چ١، ١٣٨٩.

١١) دیوانی ئیمامی شافعی(بەکوردی)، وەرگێڕان ولێکۆڵینەوەی: عزیز ئالانی، چاپخانە: شڤان-سلێمانی، چ١،٢٠١٤ز.

١٢) ژیناوەری زانایانی کورد لەجیهانی ئیسلامەتی: محمد سالّحی ئیبراهیمی، چاپخانەی مەهارەت-تاران، ١٣٦٤ هەتاوی.

١٣) ڕشتەی مرواری: عەلائەددین سەجادی، ٢٠١٠ز-١٣٨٨ک.

١٤) ڕۆحی مەولەوی: پیرەمێرد، انتشارات محمدی سقز- سنه، چ١٣٧٣،٣هەتاوی- ١٩٩٣ز.

١٥) گولاَوی سەرمۆر: صفی الرحمن المبارکفوی، وەرگێرانی: بکر حمه صدیق عارف، احسان-تاران، چ١، ٢٠٠٣ز.

١٦) عقیدەی مرضیه: عەبدورەحیمی مەولەوی، لێکۆڵینەوە ولێکدانەوە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس،١٤٠٧ك- ١٩٨٨ز.

١٧) فیقهی سیرەی پێغەمبەر: محمد سعید ڕەمەزان بوتی، وەرگێرانی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی، الهدایە-هەولێر، چ١، ٢٠١١ز.

١٨) کۆمەڵناسی کوردەواری: حوسێنی خەلیقی، چاپخانەی حەوادیس-بەغداد، چ١، ١٩٩٢ز.

١٩) مەولانا خالید وتەریقەتی نەقشبەندی: سەید محەممەد تاهیر سەید زادەی هاشمی، وەرگێرانی: دلێر میرزا، چاپخانەی قانع-سلێمانی، ٢٠٠٤.

٢٠) مەولەوی ژیان وبەرهەمی: محمدی مەلا کەریم، بلاّوکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠١ز.

٢١) مەولەوی وتەقینەوەی زمان: حەکیم مەلا ساڵح، دەزگای ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠٨ز.

٢٢) مشتێلە بێژەی عارفی وکردەی عیرفانی مەولانا مەحوی: عومەر عەزیز مەحوی، چاپخانەی ئەزمەڕ-سلێمانی، چ١، ساڵی ٢٠١٢ز.

٢٣) مفتی زەهاوی: محەمەدی خاڵ، چاپخانەی معارف-بەغداد، ١٣٧٣ك-١٩٥٣ز.

٢٤) مێژووی زانایانی کورد: مەلا تاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی، چاپخانەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠١٠ز.

٢٥) مێژووی ناودارانی کورد: بابە شێخ مەردۆخ ڕۆخانی، وەرگێڕانی: ماجد مەردۆخ ڕۆخانی، ڤیپا-ئێران، چ١، ٢٠١١ز.

٢٦) مێژووی وێژەی کوردی: سدیق بۆرەکەیی، بلاّوکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠٨ز.

٢٧) مێژووی ئەدەبی کوردی: عەلائەددین سەججادی، بلاّوکردنەوەی کوردستان-سنە، ١٣٩١ هەتاوی.

٢٨) مێژووی ئەدەبی کوردی: مارف خەزنەدار، بلاّوکراوەی ئاراس-هەولێر، چ١، ٢٠٠٨ز.

٢٩) میهرەجانی مەولەوی: چاپخانەی زەمان-بەغداد، ١٩٨٩ز.

٣٠) هەڵبژاردەیەك لە عەقیدە مرضیەی مەولەوی: بابە علی شێخ عمر قەرەداغی، چاپخانەی ئیرشاد-بەغداد، ١٤٠٥ك-١٩٨٥ز.

٣١) هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا: حەکیم مەلا ساڵح، چاپخانەی منارە-سنە، چ١، ٢٠٠٤ز.

٣٢) وتەکان: بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، وەرگێڕانی: فاروق ڕەسوولّ یەحیا، مهارات-تاران، چ٢، ١٤٢٧ك-٢٠٠٦ز.

٣٣) يادی مەردان: مەلا عبدالكريمی مدريس، چاپخانەی كۆڕی زانياری كورد-بەغداد، چ١، ١٩٧٩ز.
٣٤) ئاوڕدانەوەيەك لەبزووتنەوەی هەقە: مستەفا عەسكەری، بلاَوكراوەی ئاراس- هەولێر، چ٢، ٢٠٠٨ز.
٣٥) ئينجيلی پيرۆز (مزگێنی پەيمانی نوێی حەزرەتی عيسا)، بەشێوەی كوردی سۆرانی، چ٢.
٣٦) ئينجيلی پيرۆز، پەيمانی كۆن.
٣٧) ئينسكلۆپيديای مێژوونامە: عەلی كەندی، چاپخانەی ڕۆشنبيری ولاوان-هەولێر، چ٢، ٢٠٠٩ز.

- **سەرچاوە عەرەبييەكان**

١) ابن عربي حياته ومذهبه: أسين بلاثيوس، ترجمة: عبدالرحمن بدوي، مكتبة الأنجلو المصرية- قاهيره، ١٩٦٥ز.
٢) أثر الملل والنحل القديمة في بعض الفرق المنتسبة إلى الإسلام: الدكتور عبد القادر بن محمد عطا صوفي، الجامعة الإسلامية- مەدينەی منەوەره، چ٣٦، ژمارە (١٢٥)ی ساڵی ١٤٢٤ك-٢٠٠٤ز.
٣) إحياء علوم الدين: أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي، دار المعرفة- بەيرووت، چ١، ٢٠١٤ز.
٤) الآداب الشرعية: عبد الله محمد بن مفلح المقدسي، المحقق: شعيب الأرناؤوط + عمر القيام، مؤسسة الرسالة-بەيرووت، چ٣، ١٤١٩ك- ١٩٩٩ز.
٥) أديان الهند الكبري (الهندوسية،الجينية،البوذية): أحمد شلبي، مكتبة النهضة المصرية - قاهيره، چ١١،٢٠٠٠ز.
٦) الاديان دراسة تاريخية مقارنة: رشدي عليان وسعدون الساموك، دار الحرية- بەغداد، ١٩٧٦ز.
٧) الأساس في السنة وفقهها - العقائد الإسلامية: سعيد حوّى، دار السلام - قاهيره، چ٢، ١٤١٢ك- ١٩٩٢ز.
٨) الاستقامة: أبي العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، تحقيق: محمد رشاد سالم، جامعة الإمام محمد بن سعود، مەدينەی منەوەره ، چ١، ١٤٠٣ك.
٩) الأصول الدينية في شرح الرسالة العلاوية: محمد بن سليمان الكردي المدني، ترجمه، تحقيق: عاصم إبراهيم الكيالي-محمد المنور المدني، دار الكتب العلمية- بەيرووت، ٢٠١٥ز.
١٠) الانتصار لطريق الصوفية: أحمد صديق الغماري، مطبعة دار التأليف- ميسر.
١١) إيقاظ الهمم في شرح الحكم: احمد بن محمد بن عجيبة الحسنى، دار المعارف-قاهيره.
١٢) البداية والنهاية: أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري ثم الدمشقي، تحقيق: عبد الله بن عبد المحسن التركي، دار هجر للطباعة والنشر والتوزيع والإعلان، چ١، ١٤٢٤ك- ٢٠٠٣ز.
١٣) بريقة محمودية في شرح طريقة محمدية وشريعة نبوية في سيرة أحمدية: محمد بن محمد بن مصطفى بن عثمان، أبو سعيد الخادمي الحنفي، مطبعة الحلبي-سوريا، ١٣٤٨ك.

١٤) البهجة السنية في آداب الطريقة العلية النقشبندية: محمد بن عبد الله الخاني، مكتبة الإخلاص- توركيا.
١٥) بين السلفية والصوفية الاعتقاد الصحيح والسلوك السليم: زاهد يحيى الزرقي، مطبعة الحوادث- بەغداد، چ١، ١٩٩٠ز.
١٦) التاج الجامع للاصول في احاديث الرسول: منصور علي ناصيف، دار الفكر-بەيرووت، چ٤، ١٩٧٥ز.
١٧) تأريخ التصوف الاسلامي: عبدالرحمن بدوي، وكالة المطبوعات- كووەيت، چ٢، ١٩٧٨ز.
١٨) تأريخ السليمانية وانحائها: محمد امين زكي، ترجمة: جميل الروزبياني، طبع شركة النشر والطباعة العراقية المحدودة- بەغداد، ١٩٥١ز.
١٩) تأريخ الطرق الصوفية: يونس السامرائي، مكتبة الشرق الجديد- بەغداد، چ١، ١٩٨٨ز.
٢٠) تاريخ الفلسفة في الإسلام: دي بور المترجم، المحقق: محمد عبد الهادي أبو ريدة، دار النهضة العربية – بەيرووت، چ٣، ١٩٥٤ز.
٢١) تأريخ تصوف در إسلام: قاسم غنى، چاپ پنجم، چاپ گلشن – تهران، ١٣٦٩هـ.ش.
٢٢) تاريخ دمشق: أبو القاسم علي بن الحسن بن هبة الله المعروف بابن عساكر، المحقق: عمرو بن غرامة العمروي، دار الفكر- بەيرووت، ١٤١٥ك- ١٩٩٥ز.
٢٣) تاريخ عجائب الآثار في التراجم والأخبار: عبد الرحمن الجبرتي، تحقيق: عبدالرحيم عبدالرحمن عبدالرحيم، تقديم: عبدالعظيم رمضان، دار الكتب المصرية- قاهيره ، ١٩٩٨ز.
٢٤) تخجيل من حرف التوراة والإنجيل: صالح بن الحسين الجعفري أبو البقاء الهاشمي، المحقق: محمود عبد الرحمن قدح، مكتبة العبيكان- ڕياض، چ١، ١٤١٩ك-١٩٩٨ز.
٢٥) تذكرة الأولياء: شيخ فريد الدين العطار نيشابورى، تحقيق: أحمد آرام.
٢٦) التصوف .. المنشأ والمصادر: إحسان إلهي ظهير الباكستاني، إدارة ترجمان السنة، لاهور – پاكستان، چ١، ١٤٠٦ك – ١٩٨٦ز.
٢٧) التصوف الإسلامي في الادب والاخلاق: زكي مبارك، دار الجيل - بەيرووت ، چ١، ١٩٧٣ز.
٢٨) التصوف النفسي: عامر النجار، الهيئة المصرية العامة للكتاب-ميسر، ٢٠٠٢ز.
٢٩) التصوف والفلسفة: ولترستيس، ترجمه وتقديم: عبدالفتاح إمام، مكتبة مدبولي- قاهيره، چ٢، ١٩٩٩ز.
٣٠) التصوف وفريد الدين العطار: عبد الوهاب عزام، مؤسسة هنداوي للتعليم والثقافة-ميسر، ٢٠١٢ز.
٣١) تفسير السلمي وهو حقائق التفسير: أبو عبد الرحمن السلمي، التحقيق: سيد عمران، دار الكتب العلمية- بەيرووت، ١٤٢١ك- ٢٠٠١ز.

٣٢) تفسير القاسمي-المسمى-محاسن التأويل : محمد جمال الدين بن محمد سعيد بن قاسم الحلاق القاسمي، المحقق: محمد باسل عيون السود ، دار الكتب العلمية – بەيرووت، چ١ ، ١٤١٨ك.

٣٣) تلبيس إبليس: جمال الدين أبو الفرج عبد الرحمن بن علي بن محمد الجوزي، دار الفكر للطباعة والنشر- بەيرووت، چ١ ، ١٤٢١ك- ٢٠٠١ز.

٣٤) تنبيه الغافلين بأحاديث سيد الأنبياء والمرسلين للسمرقندي: أبو الليث نصر بن محمد بن أحمد بن إبراهيم السمرقندي، حققه وعلق عليه: يوسف علي بديوي، دار ابن كثير- بەيرووت، چ٣، ١٤٢١ك- ٢٠٠٠ز.

٣٥) تنوير القلوب في معاملة علام الغيوب: شيخ محمد امين الكردي الإربلي، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١ ، ١٤١٦ك- ١٩٩٥ز.

٣٦) التوكل: القاضي أبو يعلى، محمد بن الحسين بن محمد بن خلف المعروف بـ ابن الفراء، حققه وعلق عليه: يوسف بن علي الطريف، دار الميمان للنشر والتوزيع- ڕياض، چ١ ، ١٤٣٥ك- ٢٠١٤ز.

٣٧) الجامع لعلوم الإمام أحمد - الأدب والزهد الإمام: أبو عبد الله أحمد بن حنبل: خالد الرباط، سيد عزت عيد، دار الفلاح للبحث العلمي وتحقيق التراث، الفيوم - ميسر، چ١ ، ١٤٣٠ك-٢٠٠٩ز.

٣٨) جغرافية الباز الاشهب: جمال الدين فالح الكيلاني، المنظمة المغربية للثقافة والعلوم – مەغريب، چ٣، ٢٠١٤ز.

٣٩) الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي: محمد بن أبي بكر أيوب الزرعي أبو عبد الله، دار الكتب العلمية – بەيرووت، ٢٠٠٩ز.

٤٠) حاشيتا قليوبي وعميرة: أحمد سلامة القليوبي وأحمد البرلسي عميرة، دار الفكر – بەيرووت، ١٤١٥ك- ١٩٩٥ز.

٤١) الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية: محمد بن سليمان، ئەستەنبوڵ- توركيا، ١٩٩٢ز.

٤٢) حقائق عن التصوف: عبدالقادر عيسى، دار العرفان- سوريا، چ ١٦ ، ١٤٢٨ك – ٢٠٠٧ز.

٤٣) حقيقة التصوف بين التأصيل والتأثير: بشير جلطي، دار الكتب العلمية-بەيرووت،٢٠١١ز.

٤٤) حلية الأولياء وطبقات الأصفياء: أبو نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني، چ٢، دار الكتاب العربي- بەيرووت، ١٤٠٥ك.

٤٥) خواطر في الفقر الإختياري: الأب فاضل سيد اروس، دار المشرق – بەيرووت، چ١ ، ٢٠٠١ز.

٤٦) الرد المحتار على الدر المختار: ابن عابدين، محمد أمين بن عمر بن عبد العزيز عابدين الدمشقي الحنفي، دار الفكر- بەيرووت، چ٢، ١٤١٢ك – ١٩٩٢ز.

٤٧)	دراسات عقلية وروحية في الفلسفة الإسلامية: علي عبد الفتاح المغربي، مكتبة وهبة- قاهيره، چ١، ١٤١٥ك-١٩٩٥ز.
٤٨)	دراسات في الديانات الهندية: محمد ضياء الرحمن الأعظمي، مجلة الجامعة الإسلامية – مەدینەی منەوەرە.
٤٩)	دولة السلاجقة وبروز مشروع إسلامي لمقاومة التغلغل الباطني والغزو الصليبي: علي محمد محمد الصلابي، مؤسسة اقرأ- قاهيره، چ١، ١٤٢٧ك-٢٠٠٦ز.
٥٠)	ديوان الشافعي: محمد بن إدريس الشافعي، المحقق: عبدالرحمن المصطاوي، دار المعرفة- بەيرووت، چ٣، ١٤٢٦ك-٢٠٠٥ز.
٥١)	ديوان عبد القادر الجيلاني( دراسة اسلوبية): عبدالله خضر حمد، دار القلم- بەيرووت، ٢٠١٧ز.
٥٢)	الرسالة القشيرية: عبد الكريم بن هوازن بن عبد الملك القشيري ، تحقيق: عبد الحليم محمود، محمود بن الشريف، دار المعارف- قاهيره، ٢٠١٠ك.
٥٣)	رسالة في الصوفية والفقراء: ابن تيمية، قدم لها: محمد جميل غازي، دار المدنى- قاهيره.
٥٤)	السعادة الابدية فيما جاء النقشبندية: عبدالمجيد النقشبندي، مكتبة الحقيقة، ئەستەنبوڵ- توركيا، ١٩٩٢ز.
٥٥)	سير أعلام النبلاء: شمس الدين أبو عبد الله محمد بن أحمد بن عثمان بن قَايْماز الذهبي، المحقق : مجموعة من المحققين بإشراف الشيخ شعيب الأرناؤوط، مؤسسة الرسالة- بەيرووت، چ٣، ١٤٠٥ك- ١٩٨٥ز.
٥٦)	السير والسلوك إلى ملك الملوك: لشيخ قاسم بن صلاح الدين الخاني، تحقيق: سعيد عبد الفتاح، مكتبة الثقافة الدينية- قاهيره، چ١، ٢٠٠٢ز.
٥٧)	شرح الشفا: علي بن (سلطان) محمد، أبو الحسن نور الدين الملا الهروي القاري، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١، ١٤٢١ك.
٥٨)	شرح عين العلم وزين الحلم: نور الدين ملا علي بن سلطان محمد الهروي المعروف بالقاري، مكتبة الثقافة الدينية- قاهيره.
٥٩)	شعب الإيمان: أبي بكر أحمد بن الحسين البيهقي، تحقيق: محمد السعيد، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١، ١٤١٠ك.
٦٠)	صحيح البخاري: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، تحقيق وتعليق: مصطفى ديب البغا، دار ابن كثير – بەيرووت، چ٣، ١٤٠٧ك – ١٩٨٧ز.

٦١) صحيح مسلم: مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري، المحقق: محمد فؤاد عبد الباقي، دار إحياء التراث العربي – بەيرووت.
٦٢) صفة الصفوة: جمال الدين أبو الفرج عبد الرحمن بن علي بن محمد الجوزي، المحقق: أحمد بن علي، دار الحديث-قاهيره، ١٤٢١ك-٢٠٠٠ز.
٦٣) الصوفية في الإسلام: نيكلسون، ترجمه وعلق عليه: نورالدين شربيه، مكتبة الخانجي- قاهيره، چ٢، ١٤٢٢ك-٢٠٠٢ز.
٦٤) ضحى الإسلام: احمد أمين، دار الكتاب العربي- بەيرووت، چ١٠.
٦٥) طبقات الأولياء: ابن الملقن سراج الدين أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري ،تحقيق: نور الدين شريبه من علماء الأزهر، مكتبة الخانجي- قاهيره، چ٢، ١٤١٥ك – ١٩٩٤ز.
٦٦) طبقات الصوفية: أبي عبد الرحمن السلمي تحقيق: نور الدين شربية، مطبعة المدني- ميسر، چ٣، ١٩٨٦ز.
٦٧) الطبقات الكبرى: إمام عبد الوهاب الشعراني، ضبطه وصححه: خليل المنصور، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١، ١٩٩٧ز.
٦٨) الطرق الصوفية في مصر نشأتها ونظمها وروادها: عامر النجار، دار المعارف- ميسر، چ٥.
٦٩) گۆڤارى (العشيرة المحمدية) ژمارەى مانگى (محرم)ى ساڵى ١٣٧٦ك، وبحث عن التصوف من الوجهة التاريخية د. أحمد علوش.
٧٠) العقد الثمين في شرح أحاديث أصول الدين: حسين بن غنّام النجدي الأحسائي المالكي، المحقق: محمد بن عبد الله الهبدان، فهرسة مكتبة الملك فهد الوطنية- سعوديه، چ١، ١٤٢٣ك/٢٠٠٣ز.
٧١) العقل الصوفي في الإسلام: علي شلق، دار المدى- بەيرووت، چ١، ١٩٨٥ز.
٧٢) عوارف المعارف: للإمام شهاب الدين أبي حفص عمر السهروردي، ضبطه محمد عبد العزيز الخالدي، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١، ١٩٩٩ز.
٧٣) عواطف اللطائف من أحاديث عوارف المعارف: أحمد بن محمد بن الصديق الغماري، المكتبة المكية- سعوديه، چ١، ٢٠٠١ز.
٧٤) غاية المطلوب وأعظم المنة فيما يغفر الله به الذنوب ويوجب الجنة: ابن الديبع الشيباني، المحقق: رضا محمد صفي الدين السنوسي، مؤسسة الريان - المكتبة المكية، چ١، ١٤١٩ك – ١٩٩٨ز.

٧٥) غذاء الألباب شرح منظومة الآداب: محمد بن أحمد بن سالم السفاريني الحنبلي، تحقيق : محمد عبد العزيز الخالدي ، دار الكتب العلمية - بەيرووت، چ٢، ١٤٢٣ك-٢٠٠٢ز.

٧٦) الغنية لطاليي طريق الحق عز وجل: عبد القادر بن موسى الكيلاني، المحقق: أبو عبد الرحمن صلاح بن محمد بن عويضة، دار الكتب العلمية-بەيرووت، چ١، ١٤١٧ك- ١٩٩٧ز.

٧٧) الفتح الرباني والفيض الرحمانى: عبدالقادر الكيلاني، دار الريان التراث-ميسر، چ١.

٧٨) الفتوحات الربانية على الأذكار النووية: محمد بن علان الصديقي الشافعي الأشعري المكي، جمعية النشر والتأليف الأزهرية.

٧٩) فصول في أديان الهند: (الهندوسيَّة، والبوذيَّة، والجينيَّة، والسيخيَّة)، وعلاقة التصوّف بها: محمد ضياء الرحمن الأعظمي، دار البخاري- مەدینەی منەوەرە، چ١،١٤١٧ك – ١٩٩٧ز.

٨٠) الفلسفة الالمانية والتصوف اليهودي: يورغن هابرماس، ترجمة وتقديم: نظير جاهل، المركز الثقافي العربي، دار البيضاء- بەيرووت ، چ١،١٩٩٥ز.

٨١) فلسفة الحياة الروحية منابعها ومشاربها ونشأتها ونشأة التصوف والطرق الصوفية: مقداد ياالجن، دار الشروق- بەيرووت، چ١، ١٩٨٥ز.

٨٢) الفلسفة الصوفية في الإسلام: عبدالقادر محمود، دار الفكر العربية- قاهيرە، چ١، ١٩٦٦ز.

٨٣) فوائد الفوائح شرح منظومة فوائح لعبدالرحيم مولوى: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، دار الحريە-بەغداد، ١٤١٦ك-١٩٩٥ز.

٨٤) في التصوف الإسلامي وتأريخه: نيكلسون رينولد، نقله إلى العربية وعلقه: أبو العلاء عفيفي،قاهيرە، چ١، ١٩٥٦ز.

٨٥) قصة الحضارة: وِل ديورَانت = ويليام جيمس ديورَانت، تقديم: الدكتور محيي الدّين صَابر، ترجمة: الدكتور زكي نجيب محُمود وآخرين، دار الجيل- بەيرووت، ١٤٠٨ك- ١٩٨٨ز.

٨٦) قوت القلوب في معاملة المحبوب ووصف طريق المريد إلى مقام التوحيد: محمد بن علي بن عطية الحارثي، أبو طالب المكي، المحقق: عاصم إبراهيم الكيالي، دار الكتب العلمية – بەيرووت، چ٢، ١٤٢٦ك - ٢٠٠٥ز.

٨٧) كتاب التعريفات: علي بن محمد بن علي الزين الشريف الجرجاني، المحقق: ضبطه وصححه جماعة من العلماء بإشراف الناشر، دار الكتب العلمية –بەيرووت، چ١، ١٤٠٣ك-١٩٨٣ز.

٨٨) كتاب الزهد الكبير: أحمد بن الحسين بن علي بن موسى الخُسْرَوْجِردي الخراساني، أبو بكر البيهقي، المحقق: عامر أحمد حيدر، مؤسسة الكتب الثقافية - بەيرووت، چ٣، ١٩٩٦ز.
٨٩) كتاب اللمع: أبي نصر السراج الطوسي، حققه، وقدم له، خرج أحاديثه: عبد الحليم محمود، طه عبد الباقي سرور، دار الكتب الحديثة- ميسر، ومكتبة المثنى- بەغداد، ١٣٨٠ك-١٩٦٠ز.
٩٠) الكتاب المقدس العهد الجديد.
٩١) الكتاب المقدس العهد القديم.
٩٢) كشف الخفاء ومزيل الإلباس عما اشتهر من الأحاديث على ألسنة الناس: إسماعيل بن محمد العجلوني الجراحي، تحقيق: أحمد القلاش، مؤسسة الرسالة- بەيرووت، ١٤٠٥ك.
٩٣) الكنز الجليل في تفسير الإنجيل: وليم إدي، مجمع الكنائس في الشرق الأدنى – بەيرووت، ١٩٧٣ز.
٩٤) مجموع الفتاوى: تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، المحقق: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم، مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف- مەدينەى منەوەرە، ١٤١٦ك/١٩٩٥ز.
٩٥) مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين: محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد شمس الدين ابن قيم الجوزية، المحقق: محمد المعتصم بالله البغدادي، دار الكتاب العربي – بەيرووت، چ٣، ١٤١٦ك-١٩٩٦ز.
٩٦) المدخل إلى دراسة الأديان والمذاهب: عبدالرزاق محمد اسود، الدار العربية للموسوعات- بەيرووت، چ١، ١٩٨١ز.
٩٧) مدخل لدراسة التصوف، الشعر الصوفي في: (القرن السابع الهجري، و العصر المملوكي الاول، و العصر العثماني): علي حيدر، دار الشموس- دیمەشق، چ١، ١٩٩٩ز.
٩٨) مذكرات في الرهبنة المسيحية: الأنبا بؤانس، الكلية الإكليريكيية، الاهوتية، للأقباط الأرثوذكس.
٩٩) مرآة الجنان وعبرة اليقظان في معرفة ما يعتبر من حوادث الزمان: أبو محمد عفيف الدين عبد الله بن أسعد بن علي بن سليمان اليافعي، وضع حواشيه: خليل المنصور، دار الكتب العلمية- بەيرووت، چ١، ١٤١٧ك – ١٩٩٧ز.
١٠٠) المستدرك على الصحيحين: الإمام الحافظ أبو عبد الله الحاكم النيسابوري، بإشراف: د. يوسف المرعشلي، دار المعرفة – بەيرووت.
١٠١) المصنف في الأحاديث والآثار: أبو بكر بن أبي شيبة، عبد الله بن محمد بن إبراهيم بن عثمان بن خواستي العبسي، المحقق: كمال يوسف الحوت، مكتبة الرشد – رياض، چ١، ١٤٠٩ك.

١٠٢) معالم الطريق إلى الله بين الشريعة والطريقة والحقيقة على أضواء من نور الإسلام والإيمان والإحسان: محمود أبي الفيض المنوفي، دار نهضة- قاهيره، ١٩٦٩ز.
١٠٣) مفهوم الآخر في اليهودية والمسيحية: رقية طه جابر العلواني وآخرون، دار الفكر- ديمەشق، چ١، ٢٠٠٨ز.
١٠٤) المقاصد: الإمام النووي، المحقق: برهان محمد بدر الدين الشاعر، چ٣، ٢٠٠١ز.
١٠٥) مقدمة ابن خلدون: عبد الرحمن بن محمد بن خلدون الحضرمي، دار القلم- بەيرووت، ١٩٨٤ز.
١٠٦) الملل والنحل: محمد بن عبد الكريم بن أبي بكر أحمد الشهرستاني، تحقيق: محمد سيد كيلاني، دار المعرفة - بەيرووت ، ١٤٠٤ك.
١٠٧) المنتظم في تاريخ الملوك والأمم: عبد الرحمن بن علي بن محمد بن الجوزي أبو الفرج، دار صادر – بەيرووت، چ١، ١٣٥٨ك.
١٠٨) المنقذ من الضلال: أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي، بقلم: عبد الحليم محمود، دار الكتب الحديثة – ميسر، چ٦، ٢٠١٠ز.
١٠٩) موسوعة الأخلاق: خالد بن جمعة بن عثمان الخراز، مكتبة أهل الأثر للنشر والتوزيع-كوەيت، چ١، ١٤٣٠ك-٢٠٠٩ز.
١١٠) موسوعة المعرفة المسيحية الحياة الروحية المبسطة (٣): الأب سامي حلاق يسوعي، دار المشرق- بەیرووت، ٢٠١٢ز.
١١١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة: الندوة العالمية للشباب الإسلامي، إشراف وتخطيط ومراجعة: مانع بن حماد الجهني، دار الندوة العالمية للطباعة والنشر والتوزيع، چ٤، ١٤٢٠ك.
١١٢) نشأة التصوف الإسلامي: ابراهيم بسيوني، دار المعارف- قاهيره، چ١، ١٩٦٩.
١١٣) نشأة الفلسفة الصوفية وتطورها: عرفان عبدالحميد فتاح، دار الجيل- بەيرووت، چ١، ١٤١٣ك- ١٩٩٣ز.
١١٤) نهاية الإيجاز في سيرة ساكن الحجاز: رفاعة رافع بن بدوي بن علي الطهطاوي، دار الذخائر- قاهيره، چ١، ١٤١٩ك.
١١٥) الوسيلة في شرح الفضيلة: عبدالكريم محمد المدرس، مطبعة الارشاد-بەغداد ، چ١، ١٣٩٢ك-١٩٧٢ز.

- سەرچاوە ئینگلیزییەکان

1) Everything You Want to Know About Magick: But Were Afraid to Ask,Scanlon, Shawn Martin,1972, Chapter III.
2) Little Essa Ys Tow Ard Truth: By Aleister Crowley.
3) Meditation and Kabbalah: Aryeh Kaplan, Schocken books New York.
4) Meditation and Kabbalah: Aryeh Kaplan, Schocken books New York.
5) The Palm Tree of Devorah, Rabbi Moshe Cordovero ZTKL, Tomer Devorah, Chapter II.
6) The Palm Tree of Devorah, Rabbi Moshe Cordovero ZTKL, Tomer Devorah, Chapter VI.

- سایت وپێگە ئەلیکترۆنیەکان

1) http://www.albawabhnews.com/2847833
2) http://www.fikr.com/article/التصوّف-المسيحي-العشق-الإلهي-على-طريقة-المسيح
3) http://www.khaktv.net/all-detail.aspx?jimare=3338&type=komalayati
4) http://www.nuche.net/?p=27810
5) https://ar.wikipedia.org/wiki/صوفية
6) https://www.ehtelalnews.com/القبالاه-والمُتصوفة-اليهود/
7) https://www.marefa.org/قبالة (يهودية)




دڵە چەند مەستیت جەم بێ نە سەردا
چەند کاری ئاڵۆت وستەو ڕۆی فەردا
شەرتێوم نیەن جە بێ شەرتیی تۆ
ڕوو سیای تۆبەی سەد فەردانە بۆ
نە کەفتێ ئەوڕاپەی حەق پەرستێ
تا بێوو هەمتای مەستێ پای سستێ

تەسەووف کورەبییەکە خاك دەکاتە زێڕ، خام وکاڵ لە کوورەی حەقیقەتدا قاڵ ئەکا دەیکاتە گەوهەر، نەزان زانا دەکات، ڕێبوار دەکاتە ڕێبواری ڕێگەی حەق، پاشان دەیخاتە سەر ڕێگای خواناسی

تەسەووف لە شیعرەکانی مەولەوی و زۆرێك لەبەرهەمەکانی باڵی بەسەردا کێشاوە، مەولەوی پابەندی شێخەکانی نەقشبەندی دەبێت وهەتا دێت لە شێخەکانی تەوێڵە نزیك دەبێتەوە ولەبەر ئەمە کاریگەری ئەمانە زیاتر ڕایکێشاوە بۆ کۆڕی سۆفێتی وتاوای لێهاتووە ببێت بەسۆفییەکی بەناوبانگ، مەولەوی بەمە نەوەستاوە پشتی بەپیری تەریقەتەکانەوە ببەستێت، بەڵکو هەنگاوی ناوە بەرەو ژوورەوە وتا گەیشتووەتە مەیدانی وجود وفەلسەفەی بەخودا پەرموون، کە بتوانێ ڕازی خۆی لەگەڵ خوای خۆیدا بەبێ پەردە دەربڕێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە مەولەوی چاك لە تەسەووف گەیشتووە و ڕۆچووە، ئەمانەش دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە مەولەوی شارەزا وبەتوانا بووە لە زانستی کەلام و عەقیدەدا و چەن کتێبێکی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە.

مەولەوی زۆربەی بەیتە سۆفیگەرییەکانی بەرەو خۆشەویستی خوایی هەنگاو دەنێن، لە هەندێ بەیتیدا حاڵ ومەقەمەکانی خۆی دەردەبڕێت.